# ١٥١ چیرۆکی

# جیهانی زیندەوەران

## نووسینی ئیزۆپ





وەرگێڕان : مستەفا سەلیم نژاد

بۆ منداڵان

# ١٠١ چیرۆكی جیهانی زیندەوەران

نووسینی ئیزۆپ

وەرگێڕانی: مستەفا سەلیم نژاد






| | |
|---|---|
| سرشناسه: | کوتچانارت، راتانا |
| | Kotchanart, Rattana |
| عنوان قراردادی: | افسانه‌های ازوپ. فارسی برگزیده |
| عنوان و نام پدیدآور: | ۱۰۱چیرۆکی جیهانی زیندەوەران: نووسینی ئیزوپ/نوشته‌ی راتاناکوتچانارت، تصویرگران ورساک پیراکونچای وانگ، نارونگ پولنجرین، پتهیرا چانتارا ساروجانا، ورگیرانی مستەفا سەلیم نژاد |
| مشخصات نشر: | بانه: مصطفی سلیمزاده،۱۳۹۳ |
| مشخصات ظاهری: | ۱۲۵ص.:مصور(رنگی) |
| شابک: | ۹۷۸-۶۰۰-۰۷۳۷-۰۰-۷ |
| وضعیت فهرست نویسی: | فیپا |
| یادداشت: | عنوان به انگلیسی: Animal taies ۱۰۱ adapted from aesops fables |
| یادداشت: | گروه سنی: ب،ج. |
| عنوان گسترده: | صد و یک قصه از دنیای حیوانات |
| موضوع: | داستانهای کوتاه |
| موضوع: | داستانهای حیوانات |
| موضوع: | افسانه‌های ازوپ |
| شناسه افزوده: | جیراکونچای وونگ، ویراساک، تصویرگر |
| شناسه افزوده: | Jirakunchaivong, Veerasak |
| شناسه افزوده: | پولنجرن، نارونگ تصویرگر |
| شناسه افزوده: | Pullngern, Narong |
| شناسه افزوده: | چانتاراساروجانا، پاتهیرا، تصویرگر |
| شناسه افزوده: | Chantarasarojana, Pattheera |
| شناسه افزوده: | سلیمزاده، مصطفی، ۱۳۵٤-، مترجم |
| رده بندی دیویی: | ۸۰۸/۸۳۱د۷۷۳ک۱۳۹۳ص |
| شماره کتابشناسی ملی: | ۳٤۲۶۷۱۵ |






**له بڵاوكراوەكانی**

**كتێب و پەڕاوگەی كیا**

**بانە: ژێر مزگەوتی گەورە۰۸۷۵ ۴۲۲۷۱۱۲**


## ۱۰۱ چیرۆكی جیهانی زیندەوەران

**(نووسینی ئیزۆپ)**

راتاناكوتچانارت


وەرگێرانی: مستەفا سەلیم نژاد

نیگارکێش: وراساک پیراکونچای وانگ، نارونگ پۆلنجرین، پتهیرا چانتارا ساروجانا

هەڵەچنی: بەختیار ئەحمەدی، بیهجەت سەعیدی

پیتچنین: هێمن كیا

فەرهەنگۆک: رەحمان جەوان

نرخ: ۲۰۰۰۰ تمەن

بابەت: چیرۆک بۆ منداڵان

چاپی یەکەم: ۱۳۹۴

چاپ: دووهەم ۱۳۹۵



# ١٥١ چیرۆکی
## جیهانی زیندەوەران

نووسینی **ئیزۆپ**

وەرگێڕانی: مستەفا سەلیم نژاد



# ١٠١ چیرۆکی جیهانی زیندەوەران

نووسینی ئیزۆپ

وەرگێڕانی: مستەفا سەلیم نژاد



PDF 4 KURD



PDF 4 KURD






# نووسراوی ئیزۆپ (Aesop)

ئەفسانەکانی ئیزۆپ کۆمەڵە چیرۆکێکی کورتی لە مەڕ زیندەوەرانن کە هەر کامەو هەڵگری پەیام و دەسکەوتێکی ئەخلاقین. نووسەری ئەم چیرۆکانە کۆیلەیەکی یونانی‌یە بە ناوی ئیزۆپ (٥٦٠-٦٢٠ پ.ز) ئەفسانەکانی ئیزۆپ تەنیا بە ڕووداوێکی ساکارەوە دەقەومێن نەک بە چەندین پێشهاتی جۆراوجۆر. هەر چیرۆکە و بە گێڕانەوەیەکی ساکارەوە داڕێژی و پەیام و نوکتەیەک بۆ بەر دەنگەکەی ڕادەگوێزێت. ئەم پەیامانە وەها تێکەڵاوی چیرۆکەکان بوون کە خوێنەر بەرەو ڕووی دەرئەنجامەکەی دەکەنەوە.

زیندەوەرەکان یان کەسایەتیە خەیاڵیەکانی چیرۆکەکان زۆر بە وردی هەڵبژێردراون و تایبەتمەندییە سروشتیە سەلمێنراوەکانیان وەبیر خوێنەر دەخەنەوە بۆ وێنە دەکرێ ئاماژە بە ڕێوی بکرێت کە هەردەم فێڵبازە و کەروێشک کە هەموو کات نەگبەتە و شێر کە بێباکە و گورگ کە بێ بەزەییە.

هەر چەند ئەم ئەفسانانە زۆر لە مێژینەن بەڵام سەرنج ڕاکێش بوونی خۆیان بەردەوام پاراستووە.

هێشتا خوێنەر چێژ لە ساکاری ئەم چیرۆکانە وەردەگرێت و هەست بە ناوئاخنی پەندەکانیان دەکات.

# ئیزۆپ کێ بوو؟

سەبارەت بە سەردەمی منداڵی و لاوەتی ئیزۆپ ئاگادارییەکی ئەوتۆ لەبەردەست نییە. بەم حاڵەشەوە، لە بەرهەمەکانی هیرۆدۆت[١] مێژوونووسی ناوداری یۆنانی دا هاتووە کە ئیزۆپ لە سەدەی شەشەمی پ.ز لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەخمس[٢]؛ یەکێک لە فیرعەونەکانی میسردا ژیاوە. هەروەها هیرۆدۆت ئاماژە بە چەند خاڵێک دەکات کە دەری دەخەن ئیزۆپ کۆیلە یا خود خزمی پیاوێکی مەیگێڕ[٣] بە ناوی لادمۆن[٤] بووە.

زۆربەی ئەو شتانەی کە سەبارەت بە ژیانی ئیزۆپ و شێوەی ئەمڕۆی چیرۆکەکانی دەزانین لە نووسینەکانی ڕەبەنێک بە ناوی پلانوودێس[٥] کە لە سەدەی چواری (ز) دا ژیاوە بە دەست هاتوون. پلانوودێس لە ژیاننامەکەی ئیزۆپ دا ئاوا دەنووسێ کە ئەو خەڵکی فریگیە[٦] بووە لە ئاسیای بچووک دا. پلانوودێس هەروەها ئاماژە بەم خاڵەش دەکات کە خاوەنی یەکەمی ئیزۆپ کسانتۆس[٧] بووە کە لە بازاڕی کۆیلە فرۆشاندا چاوی پێی کەوتووە.

دەڵێن کسانتۆس لە ئیزۆپی پرسیوە " ئەگەر بتکڕم بەڵێنم پێ دەدەی باش و ڕاستگۆ بیت؟"

ئیزۆپ وەڵامی داوەتەوە " بمکڕی و نەمکڕی هەر وا دەبم".

- بەڵێن دەدەیت هەڵنەیەیت؟

ئیزۆپ گوتوویەتی: تا ئێستا بیستووتە باڵندەیەک کە لە قەفەس دا دیلە بە خاوەنەکەی بڵێت بە تەمایە هەڵبێت؟

کسانتۆس ئەم زیرەکیەی ئیزۆپی پێ خۆش دەبێت و دەیکرێت.

زۆر کەس لەو باوەڕە دان کە ژیانی ئیزۆپ لە دێلفی[٨] دا بە کۆتا هات و هۆکارەکەشی زمانی خۆی بووە.

کاتێک ئیزۆپ سەردانی دێلفی کرد کە شارێکی کۆنی یۆنانی قەدیم بووە و بە هۆی زانست و زانیاری دانیشتوانەکەی بەناوبانگ بووە لەو شتانەی کە لەوێ بەر چاوی کەوتن ناهومێد بوو. دەڵێن کە ئەو بۆ پۆلێک خەڵک ئاوا دواوە: چەند کەسێک کە لە قەراخ دەریادا وەستابوون شتێکیان بەسەر شەپۆلەکانی دەریاوە دەبینی پێیان وابوو شتێکی بە نرخە بەڵام کاتێک گەیشتە قەراخ دەریا تێگەیشتن تەنیا کۆمەڵە گژ و گیا و قەوزەیە. ئەو تامەزرۆییەی کە منی بەرەو دێلفی ڕاکێشا هەر ئاوا بوو. کاتێک کە خەڵکانی بە دەسەڵات و بە هێزی شار ئەمەیان بیست تێگەیشتن کە بیر و بڕواکانی ئیزۆپ دەکارێ ببێتە هۆکاری لە ناو چوونی دێلفی. هەر بۆیە ئیزۆپیان بە تۆمەتی دزی تاوانبار کرد و لە هەڵدێرێکەوە فڕێیان دایە ناو دەریاوە. بەم حاڵەش، دواتر خەڵکی دێلفی لەبەر تانە و لۆمەی گەلانی دراوسێیان لەو کارەی خۆیان پەشیمان بوونەوە.

---

١- Herodotus

٢- Amasis

٣- Samian

٤- Ladmon

٥- Planudes

٦- Phrygia

٧- Xanthus

٨- Delphi

# گوێدرێژێک لە کەوڵی شێردا

ڕۆژێک گوێدرێژێک کەوڵی شێرێکی بەخۆی دادا و دەستی بە گەڕان و ترساندنی گیانلەبەرە ساویلکەکانی ناو دارستان کرد. هەروا خۆی دەخافڵاند هەتا بە ڕێوییەک گەیشت و ویستی ئەویش بترسێنێت. کاتێ ڕێوی گوێی لە دەنگی گوێدرێژ بوو گوتی: "ئەگەر زەڕینتم نەبیستایە لەوانە بوو بترسابام".

نوکتە: لەوانەیە نەزان ڕواڵەتی[1] خۆی بگۆڕێ بەڵام پەیڤەکانی[2] ئاشکرای دەکەن.



١- ڕواڵەت: دیمەن

٢- پەیڤ: ئاخاوتن، قسە




# ڕێوی و لقە دڕدووک

ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕێوییەک لە کاتی بازدان بەسەر پەرژینێکدا، ڕەتەڵێکی دا؛ خێرا لقە دڕدووکێکی گرت، بۆ ئەوەی خۆی بگرێتەوە. بەڵام دڕدووک لە دەستی هاڵاو بریندار کرد. ڕێوی لە تاوان سەرکۆنەی دڕدووکی کرد و توورە بوو، لقە دڕدووک گوتی: لەوانەیە شێت بوو بی وا خۆت بە منەوە دەگریتەوە، چونکە من خۆم بە پەرژینەوە گرتووە.

نوکتە: بەدەمار لە هەمووکەس تووڕەیە.

# گوێدرێژ و کەڵەباب و شێر



شێرێکی برسی لە دارستاندا دەگەڕا، گوێدرێژ و کەڵەبابی بینی خەریکی قسە کردن بوون. شێر بە بینینی گوێدرێژ گەشایەوە و بڕیاری دا بیخوات، بەڵام

هەر کە ویستی پەلاماری گوێدرێژ بدات، کتوپڕ کەڵەباب بە دەنگی بەرز بانگێکی دا. شێر داچڵەکا و ڕای کرد. گوێدرێژ کە بینی شێر ڕا دەکات، خیرەتی بەرخۆی دا و تا شوێنێکی دوور دوای شێر کەوت، لەپڕ شێر وەرگەڕایەوە و گوێدرێژی گرت و خواردی.

نوکتە: ئازایەتی نابەجێ زۆربەی کات مەترسیدارە.

کورد دەڵێ: "ئازایەتی، جێی خۆی هەیە."



# پشیلە و مشکەکان





ماڵێک پڕ ببوو لە مشک. ڕۆژێک پشیلەیەک پێی زانی و خۆی گەیاندە ئەو ماڵە. پشیلە هەموو ڕۆژێک چەند مشکی دەگرت و دەیخواردن. پشیلە ئەوەندەی مشک خوارد تا وای لێهات مشکەکان بڕیاریان دا ئیتر لە ماڵ دەرنەکەون. ئەم بڕیارە بووە هۆی برسی بوونی پشیلە، هەر بۆیە بیری کردەوە و پیلانێکی دانا. پشیلە خۆی هەڵدایە سەر سنگێکی دارینی گەورە، دواتر بەلاداهات و خۆی مراند. کاتێک مشکەکان ئەوەیان بینی، وایان زانی مردووە و لێی نزیک کەوتنەوە. پشیلەی زیرەک ڕاپەڕی و زۆری لێگرتن. ئەم فێڵەی پشیلە زۆری بەکار هات بۆیە ویستی فێڵێکیتر بدۆزێتەوە. چەند ڕۆژ لەوە دوا پشیلە خۆی لە ئارد وەردا و لە پشت چەند فەردە ئاردەوە خۆی حەشاردا. مشکەکان لێی نزیک بوونەوە و نەیاندی بەڵام مشکێکی پیر تێگەیشت و هەموو مشکەکانی ئاگادار کردەوە و دوایە ڕووی کردە پشیلە و گوتی: جەنابی پشیلە! "تەنانەت ئەگەر بە ڕاستیش ببی بە ئارد، جارێکی دیکە هەندەرت ناکەوین".

نوکتە: کەسێک جارێک بخەڵەتێ دەبێ وریا بێتەوە.

کورد دەڵێ: "عاقڵ دوو جار ناخەڵەتێ"

# ئەو قرپۆکانەی پاشایان دەویست

قرپۆکێکی یەکجار زۆر لە گۆلاوێکدا، بە خۆشی و سەربەستی دەژیان. ئەوان هەر لە بەیانی هەتا ئێوارە قیرە قیریان دەکرد و هەڵدەبەزین. پاش ماوەیەک هەستیان بەوە کرد کە پاشایان نییە. ئەوسا لە ژوپیتێر[1] پاڕانەوە پاشایەکیان بۆ بنێرێ.

قرپۆکەکان گوتیان: "ئەی ژوپیتێری بە توانا! پاشایەکمان بۆ بنێرە فەرمانڕەواییمان بکات و بە کاروبارمان ڕابگات " کاتێ ژوپیتێر گوێ بیستی داواکەیان بوو لە قاقای پێکەنینیدا و کوتەدارێکی بۆ خستنە ناو گۆلاوەکە. شڵپەی بەرزی بەربوونەوەی کوتەدار قرپۆکەکانی ترساند و هەموو ڕایانکردە دەرەوەی گۆلاوەکە. پاش کەمێک کە کوتەدار هیچ نەجووڵا، قرپۆکێکی ئازا بەرەو دارەکە چوو. دەستی لێدا کە زانی کوتەدار ناجووڵێ، بازیدایە سەری و دەستی کرد بە هەڵبەزین. قرپۆکەکانی دیکە کاتێ ئەوەیان بینی چوونە لای و بە شادومانیەوە دەستیان کردەوە بە هەڵبەزدابەز. چەند ڕۆژێک دواتر قرپۆکەکان هیچ گوێیان نەدەدایە کوتەدار کە هەروا بێجووڵە لە ناو گۆلاوەکەدا وەستابوو. ئەوان وردە وردە تێگەیشتن کە پاشاکەیان بە جوانی فەرمانڕەوایی ناکات. ئەوسا دووبارە بە ژوپیتێریان گوت: "ئێمە پاشایەکی ڕاستە قینەمان دەوێت، پاشایەک کە بە جوانی بەکاروبارمان ڕابگات". ژوپیتێر کە ئەوەی بیست، توورە بوو، گورج لەقلەقێکی گەورەی ناردە سەریان. لەقلەق دەستی کرد بە خواردنیان. زۆری پێ نەچوو قرپۆکەکان لەو هەڵەی خۆیان پەژیوان بوونەوە.



نوکتە: پاشات نەبێ باشترە لەوەی پاشایەکی بێ بەزەییت هەبێت.

کورد دەڵێ: سەد شوکور بە کفن دزی پێشوو.

1 ـ Jove: ژوپیتێر خودای خوداکان لە ئوستوورە ڕۆمانیەکان دا.

# ڕێوییەک لە چاڵاودا

ڕۆژێک ڕێوییەک لە دارستاندا پیاسەی دەکرد، قاچی لە ڕەگە دارێک گیرا و کەوتە ناو چاڵاوێک. ڕێوی هەوڵی زۆری دا دەرباز بێ بەڵام بێسوود بوو. کەمێ دواتر گورگێک بەدەم نارۆکە[1] گوتنەوە بە گوێ چاڵاوەکەدا تێپەڕی. کاتێ ڕێوی گوێی لە دەنگی گورگ بوو هاواری کرد و داوای یارمەتی لێکرد. گورگی نەزان لە باتی بەهاناوەچوونی دەستی کرد بە پرسیار سەبارەت بەوەی ڕێوی چۆن لە چاڵاو کەوتووە؟ ڕێوی لە گورگ دەپاڕایەوە کە لەو چاڵاوە دەری بهێنێت، بەڵام گورگ زۆر دەبەنگ بوو. ئاخری ڕێوی لە پرسیارەکانی گورگ وەڕەز بوو، بە تووڕەییەوە گوتی: "دۆستی خۆشەویست! باشتر نیە جارێ دەرم بهێنی، ئەوسا دواتر پێت نیشان بدەم کە چۆن کەوتوومەتە ئێرەوە؟"

نوکتە: دەست بەکار بوون باشترە لە قسەی هەوانتە[2].

کورد دەڵێ: "گەلێ کەس وەستای قسانە و کۆڵەواری دەستانە."



١-. نارۆکە: لەبەر خۆوە گۆرانی گوتن

٢-. هەوانتە: بێ بایەخ

# شێر و ورچ و ڕێوی

شێر و ورچ چووبوونە ڕاو. بە هەردووکیان گیسکێکیان ڕاو کرد، لەسەر چۆنیەتی بەشکردنی، بەشەڕ هاتن. ئاخری ئەوەندە شەکەت بوون، هەردوو بەلادا کەوتن. ڕێوییەک لەوێوە تێدەپەڕی؛ شێر و ورچی بینی، بەدیار گیسکەوە بەلادا کەوتوون. ڕێوی خێرا پڕی بە گیسکەکەدا کرد و تێی‌تەقاند. شێر و ورچ نەیاندەتوانی دووی بکەون، گوتیان: شەرمەزارییە بۆ ئێمە لەسەر گیسکێک بەشەڕ هاتین بەڵام ڕێوی لە ئێمە زیرەکتر بوو گیسکەکەی لێ‌ڕفاندین.

نوکتە: هەندێ جار بەرهەمی زەحمەتی کەسێکی گێل کەسێکی زیرەک دەیخوات.

نوکتە: کورد دەڵێ: "هەتا بێ‌عەقڵێک نەبێت عاقڵێک نان ناخوات."



# هەڵۆ و کیسەڵ

کیسەڵێک لەبەر هەتاو خۆی هەڵخستبوو. سەبارەت بەچارەنووسە خەماویەکەی خۆی دەدوا، بە حەسرەتەوە باسی ئەوەی دەکرد کە ناتوانێ بفڕێ وکەسیش نیە فێرە فڕینی بکات. کیسەڵەکە لەبەر خۆیەوە بۆڵە بۆڵی بوو، لەو کاتەدا هەڵۆیەک بەوێدا تێپەڕی و گوێی لە قسەکانی بوو. هات لە نزیک کیسەڵ نیشتەوە و پێی گوت دەتوانم فێرە فڕینت بکەم بەڵام حەقدەستم دەوێت. کیسەڵ گوتی: هەر شتێکی بەنرخم دەستکەوێ دەتدەمێ. هەڵۆ ڕازی بوو، بە چنگورە بەهێزەکانی کیسەڵی گرت و حەوای دایە ئاسمان. ئەوان هەتا نزیک هەورەکان بەرز بوونەوە بەڵام لە ناکاو هەڵۆ کیسەڵی بەردایەوە. کیسەڵ بە کەندێکی سەختدا درا و لەتوکوت بوو. بەدەم گیاندانەوە دەیگوت: "هەر ئەوەم ڕایە دەکەوێت، بەو ژیانە ئاسوودەی خۆم قایل نەبووم و پەڵپی فڕینم گرتبوو".

نوکتە: جاری وا هەیە بۆ گەیشتن بە ئاواتێکی نابەجێ هەموو شتێک لەدەست دەچێ.

کورد دەڵێ: زۆر جار ڕازی بی بە تۆزە بۆنێ گەلێ باشترە لە سیرمەکۆنێ[1].

[1]- سیرمەکون: پێستەی بۆگەن




# جووتیار و مار

دوانیوەڕۆیەکی زستان جووتیارێک بەرەو ماڵ دەچۆوە. تووش مارێکی سڕ بوو کە لەسەر بەفر کەوتبوو. جووتیار بەزەیی بە مارەکەدا هات، هەڵیگرت و لە باخەڵی نا. هەر کە مارەکە لە باخەڵیدا کەمێک گەرم بۆوە جووتیارەکەی گەست. جووتیاری کڵۆڵ لەدوا هەناسەیدا دەیگوت: سزای بەزەیی هاتنەوە بە بوونەوەرێکی شەڕەنگێزی وەک تۆ هەر ئەوەیە.

نوکتە: هیچ چاکەیەک کەسی بێسفەت و بێئەمەگ چاو لەبەر ناکات.

کورد دەڵێ: چاکە بۆ چاکان، چاکە.

# گورگ و بەرخ

ڕۆژێک گورگێک بە قەراخ چەمێکدا تێدەپەڕی، بەرخێکی دی خەریکە ئاو دەخواتەوە. هەر کە بینی تەمای تێکرد و گوتی باشترە گەڕێکی پێ بکەم. پێی‌گوت: "ئەوە چۆن دەوێری هەموو ئاوەکەی من بخۆیتەوە؟" بەرخ بەترسەوە وەڵامی دایەوە: "پێم وا نەبێ ئەو هەموو ئاوە بە تۆزێ خواردنەوەی من کەم ببێتەوە." گورگ کە وەڵامی بەرخی بیست هاواری کرد: "ئەوە چۆن دەوێری ئاوا جوابم بدەیتەوە؟ بیرت نایە پار، کە باوکت کە ئاوا جوابی دامەوە، چیم لێ‌کرد؟"

بەرخ وەڵامی داوە: "تەمەنی من ئێستا شەش مانگە چووزانم پار چیت لە باوکم کردوە."

گورگ نەڕاندی: "تەماشای ئەو چاو و ڕووە! تۆ من بە درۆ دەخەیتەوە؟ ئێستا کە وایە تۆش وەک باوکت لێ‌دەکەم".

ئەوسا خێرا تاوی دایە بەرخ و لەت‌وپەتی کرد.



نوکتە: سادەیی و بێ‌ئازاری، بەر بەهێزی بێ‌بەزەیی ستەمکار ناگرێت.

کورد دەڵێ: ئاوی ستەمکار سەرەو ژوور دەڕوات.




# شێر و مشک

ڕۆژێک شێر لە بێشەکەیدا خەوتبوو. مشکێکی بچووک لەوێوە تێپەڕی، دەستی کرد بە هەڵبەز و دابەز بەسەر یاڵی شێرەکەدا. شێر لەخەو ڕاپەڕی و مشکی بە چنگاڵی گرت، مشکی بچووک پاڕایەوە: "پاشای گەورە! بمبوورە، ئەمجارە لێم خۆش بە قەت پیاوەتیت لەبیر ناکەم، کێ چووزانێ، لەوانەیە ڕۆژێک پیاوەتیت بدەمەوە."

شێر بەم قسەی مشک دایە قاقای پێکەنین و بەری دا و ڕۆیشت.




چەند ڕۆژ دواتر، کاتێ شێر لە دارستاندا پیاسەی دەکرد، کەوتە ناو داوی ڕاوچیەک. ڕاوچی دەیهەویست شێرەکە بە زیندوویی بگرێت، گەڕایەوە یارمەتی لەگەڵ خۆی بهێنێت. لە کاتێکدا داوەکە لە دەست و پێی شێر هاڵابوو، هیوا بڕاوی کردبوو، مشکی بچووک دەرکەوت و بەبێ لێ‌گوتن دەستی کرد بە جوونەوەی داوەکە. کاتێک شێر ڕزگار بوو، مشک گوتی: ئەها شێری مەزن، ئەگەرچی بە جەستە زۆر بچووکم، بەڵام توانیم پیاوەتی تۆ بدەمەوە.

نوکتە: هێندێ جار دۆستی بە ڕواڵەت بێبایەخ دەیسەلمێنن کە زۆر بە نرخن.

کورد دەڵێ: زێڕیش بچووکە.

# و هێشووە ترێ





ڕۆژێکی گەرمی هاوین ڕێوییەک بەنێو باخێکدا تێدەپەڕی. هەروا کە دەڕۆی، چاوی بە دارێک کەوت کە مێوێکی تێهاڵابوو هێشووی زۆر جوانی ترێی پێدا بەر بووبوونەوە. ڕێوی گوتی: ئەم ترێیە لەوانەیە تینوێتیم بشکێنێ، بۆیە خۆی کێشاوە و خۆی هەڵدا بۆ ترێکە، بەڵام نەیان گەیشتێ. چەندجار خۆی هەڵدا، بەڵام بێسوود بوو، ئاخری ناهومێد بوو ملی ڕێگای گرت و گوتی: دڵنیام ئەو ترێیە هێندە ترشە زیاترم تینوو دەکات.

نوکتە: جاری وایە بە سووک کردنی ئەو شتانەی کە دەستمان پێیان ڕاناگا، دڵخۆشی خۆمان دەدەینەوە.

کورد دەڵێ: قومارباز کە دۆڕاندی دەڵێ بە ...مەوە.

ا




# کەو و کەڵەشێرە شەڕانیەکان

ڕۆژێک پیاوێک کەوێکی کڕی، کەوەکەی بردەوە و خستیە لای قاز و مریشکەکانی. دواتر کابرا بڕیاری دا، کەوەکەی بخاتە لای ئەو دوو کەڵەشێرەی کە پێشتر کڕیبوونی. ئەوەندەی پێنەچوو کەو لە دەست پێکهەڵپڕژانی کەڵەشێرەکان وەڕەز بوو، هەرچەند دەیهەویست ببێتە دۆستیان بێسوود بوو. چەند ڕۆژ دواتر تێگەیشت کەڵەشێرەکان زۆربەی کات شەڕیانە و تەنیا کاتێک ماندوو بن واز لە یەکتر دەهێنن. کاتێک کە وای زانی گوتی: "ئەم دووانە ناتوانن دەست لە کێشەی نێوانیان هەڵبگرن، ئیتر من بۆچی بۆ دۆستایەتیان خۆم ماندوو بکەم."

نوکتە: کەسێک لەتەک هاوڕەگەزەکانی هەمیشە بەشەڕ بێ، بۆ دۆستایەتی نابێت.

کورد دەڵێ: کەسێک بە کاری خۆی نەیەت بە کاری کەس نایەت.

# سەگ و تارمایی

سەگێکی برسی، لەدووی خواردن دەگەڕا. کوتێ گۆشتی دۆزیەوە. بە دیان هەڵی گرتەوە و ڕای کردەوە بەرەو ماڵ، لە ڕێگادا بە پردێ گەیشت. کاتێ گەیشتە ناوقەدی پردەکە سەیری ئاوی چەمەکەی کرد، وێنەی خۆی لە ئاوەکەدا بینی. سەگەکە وای زانی سەگێکی‌تر لەوێیە و کوتێ گۆشتی پێیە. بۆ ئەوەی ئەو کوتە گۆشتەش بستێنێ حەپاندی. هەر کە دەمی کردەوە، کوتە گۆشتەکەی لێ‌کەوتە ناو چەمەکە و ئاو بردی.

نوکتە: وریا بە، تەماح و چاوچنۆکی نەبێتە هۆی لە دەست دانی سامانت.

کورد دەڵێ: تەماح سەری نەبڕی سەرت دەبڕێت.






# شێر و بزنەکێوی

هاوینێکی زۆر گەرم بوو. شێر و بزنەکێوی زۆر تینوو بوون و بەدوای قومێ ئاودا دەگەڕان. گۆمیلکەیەکیان دۆزیەوە تۆزێک ئاوی تێدا بوو. لەسەر خواردنەوەی ئەو تۆزە ئاوە لێیان بوو بە شەڕ، ئەوەندەیان لەیەکتر دا تا هێزیان لەبەر بڕا و لێی کەوتن. سەیری ئاسمانیان کرد ئەوا خەرتەل بە سەریانەوە دەسووڕێنەوە. شێر گوتی: "پێم وایە ئەو ئاوەی بەش کەین و بەقەدەر یەک لێی بخۆینەوە، دەنا دەبینە خۆراکی ئەو خەرتەلانە".

بزنەکێوی قسەکەی پەسەند کرد و ئاوەکەیان بەش کرد.

نوکتە: شەریکایەتی یەکێک بکەین باشترە لەوەی هەموو شتێک لە دەست بدەین.

# مەیموون و ڕەقە

مەیموونێک لە گوێ چۆمێکی گەورەدا دەژیا. ویستی لە چۆمەکە وەپەڕێت بەڵام مەلەی نەدەزانی، ڕەقەیەکی گەورەی بینی لە چۆمەکەدا مەلە دەکات. بیرێکی بە مێشکدا هات. مەیموون چووە قەراغ چەمەکە و دەستی کرد بە پیاهەڵدانی ڕەقەکە و گوتی: بە ڕاستی عەجەب مەلەوانێکی، قەتم مەلەوانی وەکوو تۆ خێرا و چالاک نەدیتووە.

ڕەقەی بەسەزمان ئەو پیاهەڵدانەی زۆر پێ خۆش بوو، گوتی: تۆ بۆ مەلە ناکەیت؟ گوتی: مەلە نازانم. ڕەقە گوتی: وەرە سوار پشتم بە، مەیموونەکە گورج خۆی هەڵدایە سەر پشتی.

هەر کە گەیشتنە ئەو بەری چۆمەکە مەیموون بازی دایە خوار و بە پێکەنینەوە گوتی: "بە ڕاستی مەلەکردنەکەشت وەک بەڕێدا ڕۆشتنەکەت، خاو و خلیچکە. پیاهەڵدانەکەم هەر بۆئەوە بوو لەو چۆمەی بمپەڕێنیەوە.



نوکتە: بڕوا بە قسەی زمان لووسان مەکە.

# مار و قرژاڵ

سەردەمانێک مار و قرژاڵ هاوڕێی یەکتر بوون، بەڵام بە هۆی جیاوازی ئاکاریان، زۆربەی کات دەمە قاڵەیان دەبوو. قرژاڵ ژیر و لەسەر خۆ بوو بەڵام مار هەمیشە دەیهەویست خەڵکی ئازار بدات. قرژاڵ ئامۆژگاری ماری دەکرد بۆ ئەوەی ئاکار و کردەوەی بگۆڕێ، بەڵام مار بە گوێی هاوڕێکەی نەدەکرد. کاتێ قرژاڵ تێگەیی ئامۆژگاری کردنی مار بێ سوودە، بڕیاری دا چاوەدێری مار بکات. ئەوەندەی پێ نەچوو ئاژەڵەکانی تریش لە ئاکارە ناشیرینەکانی مار وەزاڵە هاتن[1]. بۆیە قرژاڵ بڕیاری دا بۆ هەتاهەتایە کۆتایی بە ئازار و مەینەتەکانی مار بهێنێ.

ڕۆژێک مار خەوتبوو قرژاڵ چووە گیانی. زۆری بیر لەو مەینەتیانە کردەوە کە مار ببوە هۆکاریان، خێرا بە چنگ ملی مارەکەی گرت و بێ تێڕامان خنکاندی. کە مارەکە مرد قرژاڵ گوتی: "هاوڕێ ! ئەگەر ئاکارت چاک بوونایە و بە گوێت بکردمایە ناچار نەدەبووم ئاوا تەمێت بکەم."

نوکتە: ئەوانەی ئازار بە خەڵکی دەگەیەنن، لە دوا ڕۆژدا زیان لە خۆیان دەدەن.

کورد دەڵێ: لە سەر ڕێگایان مەخەوە با خەونان نەبینی.



١ ـ وەزاڵە هاتن: وەڕەزبوون




# قرپۆک و گاجووت

بێچوە قرپۆکێک چووە لای باوکی و گوتی: باوکە! خێوێکی[1] زۆر ترسناکم بینی، بەقەدەر کێوێک گەورە بوو، شاخی بەسەریەوە بوون و کلکێکی درێژی بە پاشوودا هاتبووە خوار، سمەکانیشی دوو فاق بوون! قرپۆکی پیر گوتی: کوڕی خۆم! ئەوەی دیوتە گاجووتە سپیەکەی جووتیارە، ئەوەندەش کە تۆ دەڵێی گەورە نیە، لەوانەیە کەمێک باڵای لە من بەرزتر بێ، بەڵام من زۆر بە سانایی دەتوانم بەقەد ئەو خۆم بماسێنم. ئەمجا کەمێ خۆی ماساند و پرسی ئەمەندە دەبوو؟ بێچوە قرپۆک گوتی: زۆر گەورە تر بوو. قرپۆکی پیر دووبارە خۆی زیاتر ماساند و پرسی ئەی ئەمجا؟ بێچوە قرپۆک وەڵامی دایەوە: "گەورەتر بوو باوکە! گەورەتر!" قرپۆکی پیر ئەمجارەیان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وا خۆی ماساند بەقەد فوودانێکی گەورەی لێهات. بەڵام پێش ئەوەی بتەقێ هەر ئەوەندە فریا کەوت بڵێ: دڵنیام ئەوەندە گەورە نەبوو.

نوکتە: خۆبەزلزان، خۆی بە کوشت دەدات.

کورد دەڵێ: بە قەدەر بەرەی خۆت پێ ڕابکێشە.

[1] -. خێو: دێو، خوول

# شێری نەخۆش

سەردەمانێک شێرێک لە دارستانێکدا دەژیا. پیر و وەڕس ببوو، توانای ڕاو کردنی نەمابوو. شێر بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە پیلانێکی دانا. چەند ڕۆژێک لە لانەکەی نەچووە دەر و هەر لەوێدا ڕاکشا و خۆی نەخۆش خست. زۆری نەخایاند هەموو گیانلەبەرەکانی دارستان پێیان زانی شێر نەخۆشە و تاک و تەرا بۆ ئەحواڵپرسی دەچوونە لانەکەی. پیلانەکەی شێر سەری گرت. هەر گیانلەبەرێک بۆ ئەحواڵپرسی دەچوو، نەدەگەڕایەوە. دوای ماوەیەک ڕێوی کە دیتی زۆرێک لە گیانلەبەرەکان دیار نەماون پێی زانی. ڕۆژێک چوو بۆ ئەحواڵپرسی بەڵام دوور ڕاوەستا و ئەحواڵی شێری پرسی. شێر گوتی: "باشم! بەڵام بۆ هێندە دوور ڕاوەستاوی؟ فەرموو وەرە ژوور". ڕێوی گوتی: زۆر سپاس قوربان! زۆر جێ پێ دەبینم هاتوونە ناو لانەکەت، بەڵام کەسیان نەهاتۆتە دەر.

نوکتە: کەسێک لە مەینەتی خەڵک پەند وەرگرێ، ژیر و وریایە.








# کەڵەشێر و گەوهەر

کەڵەشێرێک بە دوای خواردندا دەگەڕا. گەوهەرێکی بەنرخی دۆزیەوە. کە گەوهەرەکەی بینی گوتی: "ئەگەر خاوەنەکەت وەیدیبایەی زۆری پێ خۆش دەبوو بەڵام چ کەڵکت بۆ من نیە! من دەنکە گەنمێکم زۆر لە تۆ زیاتر بە دڵە".

نوکتە: شتێک زۆریش بە نرخ بێت، بۆ کەسێ کە ناتوانێ کەڵکی لێوەرگرێ، بێ نرخە.

کورد دەڵێ: قەدری زێڕ لای زێڕینگەرە.

# ئاسکی شاخدار لە گۆلاو

ڕۆژێکی زۆر گەرم ئاسکێکی شاخدار بۆ ئاو خواردنەوە، چووە قەراخ گۆلاوێک. کاتێک خەریکی ئاو خواردنەوە بوو چاوی بە وێنەی خۆی کەوت لە ناو ئاوەکەدا. شێوە و قەبارەی شاخەکانی خۆی دی و زۆر دڵی گەشاوە و شانازی بە خۆی کرد. بەڵام کە سەیری قاچەکانی خۆی کرد ئەوەندە باریک و لاواز بوون خەمی لێنیشت و کز بوو. هەر وا سەیری وێنەکەی خۆی دەکرد، لەپڕ شێرێکی لێدەرپەڕی، ئاسک کەوتە غاردان و بە توندی ڕایکرد و لە شێر دوور کەوتەوە و خۆی گەیاندە دارستان بەڵام شاخەکانی لە لق و پۆپی دار و دەوەنەکان گیران و شێر گەیشتە سەری ئەوسا پێی زانی و لەبەر خۆیەوە گوتی: چۆن خۆم فریو دابوو! بە بینینی ئەو قاچانەی کە گیانیان دەرباز کردم کز و خەمبار دەبووم و بە تەماشا کردنی ئەو شاخانەی بە کوشتیان دام، دڵ خۆش دەبووم!



نوکتە: زۆربەی کات قەدری بە نرخ ترین شتەکانمان نازانین.



# گورگێک لە کەوڵی مەڕدا

گورگێک، بڕیاری دا خۆی بگۆڕێت بۆ ئەوەی ئاسانتر خواردنی چنگ بکەوێت. هەر بۆیە کەوڵە مەڕێکی بەسەر خۆدا کرد و چووە ناو مەڕەکانەوە. بەم شێوە شوانەکەی خەڵەتاند، دەمەو ئێوارە شوانەکە، گورگیشی وەک مەڕەکان کردە کۆزە و دەرگای لەسەر داخستن. کەمێ دواتر شوانەکە گەڕاوە و دەیویست مەڕێک سەربڕێ گورگەکەی گرت و پوخت سەری بڕی.

نوکتە: کەسێ بیهەوێ زیان بە خەڵک بگەیەنێ بۆخۆی زیان دەکات.

# کارامز و مەڕ و بزن

ڕۆژێک شوانێک کارمامزێکی کردە ناو مەڕ و بزنەکانی. چەند ڕۆژ دواتر شوانەکە دەیهەویست کارمامزەکە بگرێت و بیبا. کارمامز دەستی کرد بە هەڵبەزدابەز و خۆکوتان و هاوار کردن. کاتێ مەڕ و بزنەکان ئەوەیان بینی گوتیان: "شوانەکە زۆر جار ئێمەش دەگرێ و دەمان بات، ئاوا هەڵبەزدابەز و هاوار ناکەین".

کارمامز گوتی: ئێوە دەبات دەتان دۆشێ یان هەڵتان دەپاچێ بەڵام من دەبات سەرم برێ.

نوکتە: هاواری کەس بێ هۆ نیە.

کورد دەڵێ: دەرویش دەزانێ کەشکۆڵ چی تێدایە.



# ورچ و کەندووی هەنگوین

ڕۆژێک ورچێک چووە ناو باخێک. دوای کەمێک گەڕان، کەندوویەکی گەورەی هەنگوینی بینی. ورچ بە بینینی کەندووە هەنگوینەکە زۆر شادومان بوو. چووە لای و دەستی بە هەنگوینخواردنکرد، بەڵام هەنگەکان ورووژان و پەلاماری سەروسەکوتیان[1]دا و، دەم و چاو و لووتیان گەست. ورچ زۆری ئازار پێ گەیشت، بۆ ئەوەی هەنگەکان لە خۆی دەرکات بە چەپۆک داهاتە سەر و چاوی خۆی و سەر و چاوی خۆی هەڵدڕی و خۆی کوشت.

نوکتە: خۆشییەک کە بە سەختی و مەینەتی[2] بێتە دەستت، ئازارت پێ دەگەیەنێت.

کورد دەڵێ: تەماح سەری نەبڕی سەرت دەبڕێت.



١-. سەروسەکوت: دەم و چاوی ناحەز

٢-. مەینەتی: ڕەنج




# قاز و قورینگەکان

چەند قاز و قورینگێک وێکڕا[1] لە گۆلاوێک مەلەیان دەکرد. کتوپڕ ڕاوچییان لێدەرپەڕی و داوی بۆ هاویشتن. قورینگەکان زوو هەڵفڕین و خۆیان دەرباز کرد بەڵام چونکە قازەکان قەڵەوتر بوون و هێواش‌تر دەبزوان لە داو کەوتن و بوونە نێچیری ڕاوچی.

نوکتە: وریای کارێک بە کە مەترسیەکەی بۆ تۆ و ئاوەڵەکانت چوون یەک نیە.

کورد دەڵێ: بە تەنافی خەڵکی مەچۆرە ناو چاڵەوە.

١- وێکڕا: بەسەر یەکەوە، لەگەڵ یەکتری

# پشیلە و زەنگۆڵە

شەوێک مشکەکان کۆ بوونەوە بۆ ڕاوێژ[1] کردن سەبارەت بە دەرباز بوون لە چنگی پشیلە کە دوژمنی دێرینەیان بوو. هەر کام لە مشکەکان پێشنیاری شتێکی دەکرد تا نۆبە گەیشتە مشکێکی هەرزەکار. مشکی هەرزەکار گوتی: من پیلانێکم هەیە، هەمووتان دەزانن گەورەترین مەترسیەک کە ڕوو بە ڕوومان بۆتەوە ئەوەیە ئەم دوژمنەی ئێمە زۆر بێچرپە و بە هێواشی لێمان نزیک دەبێتەوە. ئێستا ئەگەر شتێک هەبێت کە لە نزیک بوونەوەی پشیلە ئاگادارمان کات بە سانایی دەتوانین لە چنگی دەرباز ببین، بۆیە من پێشنیار دەکەم زەنگۆڵەیەکی بچووک لە ملی پشیلە بکەین، بەم شێوەیە هەر کاتێک لێمان نزیک بکەوێتەوە، خێرا ئاگادار دەبین و دەرباز دەبین. هەموو مشکەکانی تر چەپڵەیان بۆ لێدا و گوتیان ئافەریم بۆ ئەو بلیمەتیەت. بەڵام مشکێکی پیر هەستا و گوتی: زۆر چاکە بەڵام دەبێ کێ زەنگۆڵەکە بکاتە ملی پشیلە؟

هەموو بێدەنگ بوون. ئەوسا مشکی پیر گوتی: پێشنیار کردنی چارەسەرێک کە بە کەس جێ بە جێ نابێ، نابەجێیە. ئەوسا لێی دا و ڕۆیشت.

نوکتە: قسە کردن سەبارەت بە ئەنجام دانی کارێک زۆر لە کردنی ئەوکارە ئاسانترە. کورد دەڵێ "قسە هەموو کەسێکی پێ دەوێرێ.

١- ڕاوێژ: مەشوەرەت





# گورگ و بەرخ و بزن



ڕۆژێک گورگێکی فێڵباز، بەرخێکی بینی دوای بزنێک کەوتبوو. گورگ بە بەرخی گوت: ئەوە بۆ شوێن ئەو بزنە بۆگەنە کەوتووی؟ باشتر وایە بچیتەوە ماڵ شیر بخۆی.

بەرخ کە ئەمەی بیست جوابی دایەوە " لەوانەیە تۆ ڕاست بکەی بەڵام دایکم منی بەم بزنە سپاردوە و دەش‌زانم زۆرت پێ‌خۆشە بمخۆی، بۆیە قەت بڕوات پێ‌ناکەم".

نوکتە: لادان لە قسەی دایک و باوک بەرەو هەڵدێرت دەبات.

# خوێفرۆش و کەرەکەی

خوێ فرۆشێک باری کەرێکی خوێ کرێ. لە گەڕانەوەدا کەرەکەی کەوتە چەمێکەوە. کاتێ کەرەکە هەستایەوە، تێگەیی بارەکەی سووک بووە چونکە هێندێک لە خوێکە تووابۆوە. بۆیە هەر کە دەگەیشتنە نزیک ئاوێک کەرەکە خۆی دەخستە ناو ئاوەکە. کەرەکە ئەوەی زۆر پێخۆش بوو دەستی کرد بە زەڕین. خوێفرۆشەکە، لە فێڵی کەرەکە تێگەیشت. جاری دواتر باری کەرێکی، لۆکە کرێ. ئەمجارەشیان هەر کە گەیشتنە گوێ چەمەکە کەرەکە خۆی خستە ناو ئاو، بەڵام لۆکە ئەوەندەی ئاو کێشا بوو کەرەکە وەخت بوو لە ژێریا سەقەت بێت.

نوکتە: یەک ڕێگە چارە بۆ هەموو کێشەیەک نابێت.

کورد دەڵێ: لە هەموو هەورێک باران نابارێت.





# ئەو ڕێوییەی کلکی قرتابوو

ڕۆژێک ڕێوییەک کەوتە تەڵەوە. زۆر لە خۆی نووسا و پەلە قاژەی کرد هەتا توانی خۆی دەرباز بکات، بەڵام کلکی قرتا. ڕێوی دەیزانی ئەگەر هاوڕێکانی بەوە بزانن پێی ڕادەبوێرن، هەر بۆیە پیلانێکی دانا بۆ ئەوەی بە ڕێوییەکانیتر بسەلمێنێ کە بێکلک جوانترن. ئەمجا هەموو ڕێوییەکانیتری لە خۆی کۆ کردەوە و پێشنیاری پێکردن هەموویان کلکیان ببڕن. ڕێوی گوتی بەبێ کلک نەک هەر زۆر سەرنجڕاکێشترن، بەڵکو ئەو کێش و قەبارە زۆر و زەوەندەشیان لەکۆڵ دەکەوێت. یەکێک لە ڕێوییەکان قسەکەی پێ بڕی و گوتی: هاوڕێ ئەگەر کلکت نەقرتایە قەت ئەو قسەت نەدەکرد.

نوکتە: بە گوێی ئەو کەسە مەکە کە دەیهەوێ داتبەزێنێتە ئاستی خۆی.

کورد دەڵێ: سەرچۆپی بەی بە گامێشێ، بەرەو کادێنت دەکێشێ.

# کەروێشک و کیسەڵ



ڕۆژێ کەروێشکێک بە کیسەڵی ڕادەبوارد و دەیگوت زۆر خاو و خلیچکی، بەڵام کیسەڵ گوێی پێ‌نەدا و گوتی: ڕاستە تۆ وەک با خێرای بەڵام ئەگەر پێشبڕکێ بکەین، دەدۆڕێی.

کەروێشک دای لە قاقای پێکەنین و گوتی: ئامادەم بۆ پێشبڕکێ، تەنانەت ڕازی بوو ڕێوی ڕێچکەی پێشبڕکێ و هێڵی کۆتایی پێشبڕکێی ڕاکردنەکە دیاری بکات. ئەو ڕۆژەی کە دەبوو پێشبڕکێکەی تێدا ساز بکرێ هات و ئاژەڵی زۆر کۆ بوونەوە. کیسەڵ وکەروێشک دەستیان دایە پێشبڕکێ. کیسەڵ قەت تۆزێکیش ڕانەوەستا و لەسەر خۆ و بەردەوام بەرەو هێڵی کۆتایی بەڕێ کەوت، بەڵام کەروێشک، لە ناوەڕاستی ڕێگا دا لایدایە سێبەری دارێک و گوتی "تا کیسەڵ دێت سەرخەوێک دەشکێنم." کە لە خەو هەستا بە هەموو توانای خۆی کەوتە ڕاکردن بەرەو هێڵی کۆتایی بەڵام کاتێ گەیشتە ئەوێ، بینی وەختێ ئەو لە خەودا بووە کیسەڵ بە سانایی گەیشتۆتە هێڵی کۆتایی.

نوکتە: ئەوەی لەسەرخۆ و بەردەوامە، دەیباتەوە.



# مشکە کوێرە و دایکی

مشکە کوێرەیەک کە زگماک کوێر بوو، بە دایکی گوت: "دایە من دڵنیام دەتوانم ببینم." دایکی مشکە کوێرە زۆر خەفەتبار بوو ویستی بە منداڵەکەی بڵێ بەهەڵەدا چووە، هەربۆیە چەند دانە بەرووی لەپێش کورەکەی دانا و گوتی: ئەمانە چین؟ مشکە کوێرە گوتی: ئەمانە بەردوچکەن. دایکی پێی گوت: "کوڕی ئازیزم، تۆ نەک هەر نابینای، بەڵکو هەستی بۆن کردنیشت نیە."

نوکتە: جاری وایە کاتێ بەشتێکەوە دەنازین، تێدەگەین نەک ئەو شتە، بەڵکو زۆر شتی تریشمان نیە.



# هەڵۆ و قاڵاو



ڕۆژێک هەڵۆیەک، لە لەوەڕگایەکدا داهاتەوە. هەمان ڕۆژ شوانێ، مەڕەکەی لەو لەوەڕگایەدا دەلەوەڕاند. هەڵۆ داهاتە بەرخێک، هەڵیگرت و بردی. قاڵاوێک ئاگای لەو بەزمە بوو ئیرەیی بە هێزی هەڵۆ برد. قاڵاو بڕیاری دا لاسای هەڵۆ بکاتەوە. بەرەو مێگەلەمەڕ هەڵفڕی، دوایی تاوی دایە پشتی بەرانێکی گەورە و ویستی لە عەرز حەوایدا. قاڵاو نەک هەر بەرانی بۆ نەجوولا بەڵکو چڕنووکەکانی، لە خوریی بەرانەکەدا گیریان خوارد و هەرچی هەولی دا خۆی بۆ دەرباز نەکرا. شوان ئاگای لەم کەین و بەینە بوو تاوی دایە قاڵاو گرتی و باڵەکانی کورت کردەوە و دای بە کوڕەکەی. کوڕی شوانەکە پرسی: "باوکە ئەمە چ دەعبایەکە؟"

شوان جوابی داوە " ئەوەندەی من بزانم قاڵاوە بەڵام بۆخۆی پێیخۆشە بە هەڵۆی بزانی".

نوکتە: بە گۆڕینی کردارت ناتوانی سروشتی خۆت بگۆڕی.

کورد دەڵێ: پاروو بە قەدەر زاری خۆت بگرە.

# شێر و ڕێوی و گوێدرێژ

شێر و ڕێوی و گوێدرێژێک ڕێکەوتن کە لە کاتی ڕاودا هاوکاری یەکتر بکەن. ڕۆژێ نێچیرێکی گەورەیان دەست کەوت. شێر بە گوێدرێژی گوت دابەشی کات، گوێدرێژ بە وردی نێچیرەکەی بە سێ بەش دابەش کرد و داوای کرد هەرکام بەشێک هەڵبژێرن. بەڵام شێر لەو کارە زۆر تووڕە بوو گوێدرێژەکەی کوشت. پاشان داوای لە ڕێوی کرد نێچیرەکە دابەش کات. ڕێوی هەموو نێچیرەکەی خستە بەردەم شێر و کوتێکی بچووکی بۆخۆی دانا. شێر گوتی: هاوڕێی خۆشەویست. بڵێ با بزانم، هونەری دابەش کردن لە کێ فێر بووی؟ ڕێوی گوتی: لە چارەنووسی گوێدرێژەوە فێر بووم.

نوکتە: کەسێ لە چارەڕەشی خەڵقی دەرسی ژیان فێر بێت، بەختەوەرە.



# کوللە و مێروولە

لە ڕۆژێکی جوانی هاویندا، کوللەیەک بەدەم گۆرانی وتنەوە هەڵبەز و دابەزی دەکرد. تۆزێ دواتر، مێروولەیەک کە دەنکە کابەیەکی[1] پێ بوو، بە پەنایدا تێپەڕی. دەنکە کابە زۆر قورس بوو، مێروولە بۆ هەڵگرتنی، زۆر خۆی ماندوو دەکرد.کوللە مێروولەی ڕاگرت و پرسی: "بۆچی لە جیات ئەو هەموو ماندوو بوونە لە تەک مندا نایەیتە گەشت؟" مێروولە گوتی: من خەریکم ئاتاجی[2] زستان کۆ بکەمەوە. بە من دەکەی تۆش خەریکی کۆ کردنەوەی ئاتاج بە. کوللە گوتی: بۆچی دەبێ خۆم بۆ خۆراک ماندوو بکەم؟ چەندی بمهەوێ بە دەور و بەرمدا خۆراک زۆرە. مێروولە ئیدی هیچی نەگوت و ملی ڕێگای گرت. کاتێ زستان داهات، کوللە خۆراکی دەست نەدەکەوت و زۆر برسی بوو، کاتێک بە شوێن خۆراکدا دەگەڕا چەند مێروولەی دی خەریکی خواردنی کابە بوون، ئەوان هەر ئەو کابانەیان دەخوارد کە لە هاویندا بە ڕەنج و ماندوو بوون کۆیان کردبۆوە.

نوکتە: هەموو کات دەبێت خۆمان بۆ ڕۆژانی مەبادا ئامادە بکەین.

١- کابە:گەنمە شامی

٢- ئاتاج: زەخیرە، پێداویستی

# تاوس و قەلەباچکە



ڕۆژێک قەلەباچکەیەک لە کاتی پیاسە کردن بە دارستاندا چەند پەڕی تاوسی دۆزیەوە. قەلەباچکەی نەزان پەڕە تاوسەکانی هەڵگرتەوە و بە کلکیەوە بەستنی. کاتێ پەڕەکانی بە کلکی خۆیەوە بینی وا تێگەیشت کە ئەویش دەتوانێ ببێت بە تاوس، هەر بۆیە بڕیاری دا بچێتە ناو پۆلە تاوسێکەوە. کاتێ گەیشتە لایان، تاوسەکان بە فێڵەکەیان زانی. تاوسەکان پەڕەکانیان بە دەندووک لە کلکی کردەوە و کەوتنە گیانی. قەلەباچکە گەڕایەوە ناو قەلەباچکەکانی تر، ئەوانەی ئاگایان لەو ڕووداوە بوو لێی عاجز و تووڕە بوون. یەکێکیان پێی گوت: ئەگەر لە ژیانی خۆت لە نێو ئێمەدا نارازی نەدەبووی و قەدری ئەو شتانەت دەزانی کە سروشت پێی داوی، نەدەبوویتە گاڵتە جاڕی تاوسەکان و ئێمەش لێت زویر نەدەبووین.

نوکتە: دەبێ قەناعەتمان بەو شتانە هەبێت کە خۆمان هەمانەو چاو نەبڕینە ژیانی کەسانیتر.

# بزنەکێوی و گورگ

ڕۆژێک لە ڕۆژان بزنەکێوییەک بۆ ڕاکردن لە چنگ گورگ، بە شاخێک هەڵگەڕا. گورگ نەیدەتوانی بە شاخەکەدا هەڵگەڕێ هەر بۆیە بە دەستی خاڵی و سکی برسی لێی دا ڕۆیشت. کاتێ گورگ ڕۆیشت، بزنەکێوی لە شاخ هاتە خوار چوە سەر گۆلاوێک. کە خەریکی ئاو خواردنەوە بوو شانازی بە خۆیەوە دەکرد و دەیگوت: بە ڕاستی بەهێز و بە توانام! چەند ڕۆژێک پاش ئەوە، بزنەکێوی، تووشی گورگ بۆوە و بەڵام ئەم جارە لە جیاتی ڕاکردن بڕیاری ڕووبەڕوو بوونەوەی دا. بزنەکێویی حۆل ویستی قۆچێک لە گورگ بدات بەڵام گورگ پەلاماری قوڕگی دا و خنکاندی.

نوکتە: کە زیاد لە پێویست بە خۆمان بنازین لەوانەیە تیابچین.



# شێر و گوێدرێژ



ڕۆژێک گوێدرێژ و شێر ڕێکەوتن پێکەوە بچنە ڕاو. لە کاتی گەڕان بەدوای نێچیردا گەیشتنە ئەشکەوتێک. لەو ئەشکەوتەدا چەند بزنە کێوی دەژیان. شێر لە بەردەم ئەشکەوتەکەدا خۆی حەشار دا، گوێدرێژیش چوە ناو ئەشکەوتەکە و دەستی کرد بە جووتە هاویشتن و زەڕە زەڕ. بزنەکێوییەکان ترسان و ڕایان کردە دەرەوە. شێریش لە بەر دەرگا دەیگرتن. دوایە گوێدرێژ هاتە دەر و لە شێری پرسی " بەڕای تۆ

هاوڕێیەکی لێهاتووم یان نا؟" شێر گوتی: "بێ گوومان لێهاتووی، دڵنیا بە ئەگەر نەمزانیبا گوێدرێژی، بۆخۆیشم لێت دەترسام".

نوکتە: ئەوانەی خەریکی کارێک دەبن کە لێیان ناوەشێتەوە دەبنە گاڵتە جاڕ.



# ڕێوی فێڵ باز

ڕێوییەک چووە لای لەقلەق. داوای لێکرد ئەگەر ئەو ئێسقانەی لە قوڕگی گیراوە بۆی دەربێنێ، خەڵاتێکی گرانبایی پێ دەدات. لەقلەق ڕازی بوو سەری خستە ناو دەمی ڕێوی و ئێسقانەکەی بۆ هێنایە دەر، ئەوسا داوای خەڵاتەکەی کرد. ڕێوی پێکەنی و گوتی: هەر ئەوەندەی ڕێگەت پێدرا سەرت بە سەلامەت لە دەمی ڕێوییەک بهێنیتە دەر، گرانبایی‌ترین خەڵاتت پێ‌دراوە.



نوکتە: کاتێ خزمەتی کەسێکی بێ‌ئەمەگ دەکەی چاوەڕوانی چاکە مەبە: ئەگەر بیوەی بوویت شوکرانەبژێر بە.





# قالاو و گۆزە

لە ڕۆژێکی گەرمی هاویندا، قالاوێکی تینوو، گۆزەیەکی دۆزیەوە. سەری پێدا کرد ئاو بخواتەوە، تێگەیشت تەنیا تۆزێک ئاو لە بنی گۆزەکەدایە. قالاو زۆری هەوڵدا بەڵام بێ سوود بوو. دەمی نەدەگەیشتە ئاوەکە، هیوای لێبڕا و وازی هێنا. بەڵام کتوپڕ بیرێکی بە مێشکدا هات، بەردوچکەیەکی هەڵگرت و خستیە ناو گۆزەکە، دانەیەکیتر و دانەیەکیتریشی هێنا، ئەوەندەی بەردوچکە خستە ناو گۆزەکە هەتا ئاوەکە هاتە سەرەوە و دەمی پێی گەیشت و تێراو بوو.

نوکتە: وردە وردە دەگەی بە ئاوات.

# بێچوە قرژاڵ و دایکی

ڕۆژێک قرژاڵێک بە بێچوەکەی گوت: کوڕم بۆچی خوارە خوار بە ڕێدا دەڕوی؟ دەبێ ڕاست و ڕەوان ڕێ بکەی. بێچوە قرژاڵ گوتی: "دایە گیان! قسەی تۆیە، بۆ فێری ڕاست ڕێ کردنم ناکەیت؟ بەڵێن بێت لەمە بەدوا چۆن تۆ بڵێی وا ڕێ دەکەم."

دایکەقرژاڵ، زۆر بە زەحمەت هەوڵی دا ڕاست ڕێ کردن فێری کوڕەکەی بکات بەڵام نەیدەتوانی، ئاخر بۆخۆیشی خوارە خوار بەرێدا دەڕۆیشت.

نوکتە: سەرمەشقی کەسێک بیت کاراترە لەوەی تەنیا ئامۆژگاری بکەیت.



# قاز و قالاو



سەردەمانێک قالاوێ لە باخێکی جواندا دەژیا. قالاو، هەموو ئاواتی ئەوە بوو وەکو قاز سپی سپی بێت. قالاو پێی وابوو هۆکاری جوانیی قاز خۆ شۆردنە. قالاوی نەزان ئەو بیرۆکەی لە مێشک دەر نەدەچوو، ژیانی ئاسایی واز لێهێنا و چووە ناو چۆم و گۆلاوەکانەوە. بەڵام هەر چەند خۆی دەشۆری ڕەنگی نەدەگۆڕا. لە لایەکی تریشەوە ئەوەندەی قەوزە خواردبوو زەرد هەڵگەڕا و نەخۆش کەوت. هەر وازی نەهێنا هەتا بەهۆی برسییەتی و نەخۆشییەوە، مندار بۆوە.

نوکتە: گۆڕینی کار و کردەوە سروشتی کەس ناگۆڕێ.

کورد دەڵێ: قەل ویستی لاسای کەو بکاتەوە ڕێکردنی خۆی لە بیر چۆوە.



# ڕێوی و بزن



ڕۆژێک ڕێوی کەوتە ناو چاڵاوێک و هەر چەند هەوڵی دا نەیتوانی بێتە دەر. ڕۆژی دوایی، بزنێکی تینوو هات ئاو بخواتەوە، کاتی بزن ڕێوی بینی پرسی: ئەرێ ئاوەکە ساردە یان نا؟ ڕێوی تێگەیشت بزن حۆلە، دەستی کرد بە پێداهەڵدانی ئاوەکە کە چەندە ساردە و چەندە سووکە. بەو فێڵە هانی بزنەکەی دا بۆ ئاو خواردنەوە بێتە ناو چاڵاوەکە. بزن هەر لە بیری ئاو خواردنەوە دابوو، خۆی هەڵدایە ناو چاڵاوەکە. کاتی بزن کەوتە ناو چاڵاوەکە، ڕێوی گوتی: دەبێ بۆ دەرچوون لێرە چارەسەرێک بدۆزینەوە. بە بزنی گوت: ئەگەر ناو چاوانت بە دیوارەکەوە بنێی و سەرت دانەوێنی ئەمن دەچمە سەر پشتت و خۆ هەڵدەدەمە دەر، ئەوسا یارمەتی تۆش دەدەم و دەرتدەهێنم.

بزن گوتی: باشە. ڕێوی پەڕیە سەر پشتی و خۆی هەڵدایە دەر. بزن داوای لە ڕێوی کرد لە چاڵەکە دەریبهێنێتەوە، بەڵام ڕێوی پێکەنی و پێی گوت: "بزنە حۆل! ئەگەر کەمێک مێشک لەسەرتا بایە پێش ئەوەی خۆت هەڵ بدەیتە ناو چاڵاو، بیرت لە هاتنە دەر دەکردەوە".

نوکتە: سەرەتا بیر بکەوە ئەوسا دەست بەکار بە.






# کەڵەشێر و ڕێوی

بەیانییەکی زوو، ڕێوییەک چووە ناو مەزرایەک. کتوپڕ لە داو کەوت. جووتیار ئەو داوەی بۆ دانابوو. کاتێ ڕێوی لە هەوڵی خۆ دەرباز کردندا بوو، کەڵەشێرێک لە دوورەوە چاوی لێبوو. کەڵەشێر زۆر بە وریایی و کاوەخۆ لە ڕێوی نزیک کەوتەوە. ڕێوی کاتێ کەڵەشێری بینی گوتی: هاوڕێی خۆشەویست! ئاگات لێیە تووشی چ بەڵایەک بووم؟ لەو پەنایە دەڕۆیشتم گوێم لە دەنگی خۆشی ئاوازی تۆ بوو. هاتم دووبارە گوێ بۆ دەنگە خۆشەکەت شل کەم، ئاوام بەسەر هات. بێ زەحمەت دەتوانی یارمەتیم بدەی دەرباز بم؟ کەڵەشێر جوابی نەداوە گورج خۆی گەیاندە جووتیار و هەواڵەکەی پێ گەیاند. جووتیار چووە لای داوەکە و ڕێوی گرت.

نوکتە: یارمەتی تاوانبار بدەی دەبیتە هاوبەشی تاوانەکانی.

# ماسیگر و ماسیە بچکۆلانەکە



ڕۆژێک ماسیگرێک پاش چەند کاژێر هەوڵ و تەقەللا تەنیا ماسیەکی بچووکی بۆ گیرا. کاتێ ماسیە بچووکەکەی لە قولاپ کردەوە، ماسییەچکۆل پێی گوت: ئەی ماسیگر تکایە ڕێم بدە بڕۆم. من هێندە بچووکم بۆ خواردن نابم. ئەگەر بمخەیتەوە ناو چەمەکە، بەمزووانە زۆر گەورە دەبم، ئەوکات دەتوانی خواردنێکی خۆشم پێ ساز بکەی. ماسیگر گوتی: نا نا ماسی بچووک، تۆ هەر ئێستا هی منی ئەگەر بەرتبدەم ئیدی ناتوانم بتگرمەوە.

نوکتە: ئەو شتە بچووکەی کە ئێستا لەبەر دەستمانە زۆر بە بایەختره لەو شتە گەورەی داهاتوو کە هیوامان پێیەتی.

کورد دەڵێ "هەشت بێ و لە مشت بێ نەک نۆ بێ و نەبێ".

# ڕێوی و لەقلەق



[illegible] ساڵێک ڕێوی و لەقلەق هاوڕێ بوون. ڕۆژێک ڕێوی لەقلەقی خوڵق کرد بۆماڵی خۆی. ئەو شەوە ڕێوی کەمێ شۆرباوی کردە سەر دوو سینی و لە بەر دەمی خۆیانا دای نا. ڕێوی بە ئاسانی شۆرباکەی خۆی خوارد، بەڵام لەقلەق هەر تەقەی دەندووکی دەهات و هیچی بۆ نەخورا. دوای نانی شەو، لەقلەق هەستا بڕوات ڕێوی گوتی: داخەکەم شۆرباکەت پێ خۆش نەبوو بۆیە کەمت خوارد!

لەقلەق گوتی: تکایە قسەی وا مەکە، هیوادارم تۆش بێی بۆ ماڵی من بۆ ئەوەی منیش خزمەتت بکەم.

چەند ڕۆژ دواتر ڕێوی چوو بۆ ماڵی لەقلەق. کاتێ ڕێوی چووە سەر سفرە، لەقلەق چێشتەکەی هێنا کە لە ناو کووزوی ملباریکی زار بچووکدا بوو. ڕێوی نەیدەتوانی دەم بخاتە ناو کووزوەکە و لێی بخوات، تەنیا گۆزەکەی لستەوە بەڵام لەقلەق بە ئاسانی دەنووکی تێ ڕۆدەکرد و دەیخوارد. کاتێ لەقلەق لە خواردنەکەی تەواو بوو بە ڕێوی گوت: من بە داخەوە نیم کە هیچت نەخوارد.

نوکتە: چۆن لەگەڵ خەڵکیدا ڕەفتار بکەی ئاوا ڕەفتارت لە تەکدا دەکەن.



# ڕێوی و پڵنگ



ڕۆژێکی گەرمی هاوین ڕێوی و پڵنگ دەمە قاڵەیان بوو. دەیانویست بزانن کامیان جوانترن. کاتێ پڵنگ بۆی دەرکەوت ئەو باسە کۆتایی نیە پێستە خاڵدارەکەی نیشان داو شانازی بە جوانی پێستی کرد و بە ڕێوی پێکەنی. بەڵام ڕێوی هەڵیدایە و گوتی: " دۆستی ئازیز پێستت بەڕاستی جوانە بەڵام بە داخەوە بێعەقڵی. لە جێی ئەوە، من زۆر زیرەکم و دەتوانم خۆم لە دەست دوژمنەکانم ڕزگار بکەم.

نوکتە: بەژن و باڵای جوان بە واتای هۆش و عەقڵ نیە.

کورد دەڵێ: "بە ڕیش نیە بە ئیشە".

# ڕێوی و ژیشک



ڕۆژێک ڕێوی کەوتە ناو چەمێک و ئاو بردی و لە تاڤگەیەک بەریدایەوە. ڕێوی هەموو لەشی ڕەش و شین هەڵگەڕابوو نەیدەتوانی بجووڵێ. قەدەرێک لەجێدا کەوت. کەمێ دواتر دەستەیەک مێشوولەی خوێنخۆر و برسی کەوتنە وێزەی. دوا ماوەیەک ژیشکێک بەوێدا تێپەڕی. چاوی بە ڕێوی کەوت دەیناڵاند.

ژیشک بە بیستنی ئاه و ناڵەی ڕێوی زۆر دڵگران بوو. چوە پێش و پرسی: دەتهەوێ یارمەتیت بدەم؟ ڕێوی گوتی: ئەم مێشوولانە بە هیچ جۆرێک ئازارم نادەن. ژیشک گوتی: چۆن ڕێی تێدەچێ؟ ناتهەوێ دەریان بکەم؟ ڕێوی گوتی: "نەخێر چۆن ئەم مێشوولانە تێری سکی خۆیان، خوێنیان مژیوە و تێر بوون، ئەگەر ئەمانە دەرکەی دەستەیەکی برسیتر دێنە جێیان و ئەوبرە خوێنەی لە لەشمدا ماوە دەیمژن.".

نوکتە: لە نێوان خراپ و خراپتردا ناچارین خراپەکە هەڵبژێرین.

کورد دەڵێ "لە تاو ماری پاڵ بە ئاگرەوە دەدا".



# چوار گاجووت و شێرێک



شێرێک هەموو ڕۆژێک بە دەوری مەزرایەکدا ڕاوێچکەی دەکرد. ئەو مەزرایە چوار گاجووتی تێدا بوو. شێر زۆر جار هەوڵی دابوو گاجووتەکان بخوا، بەڵام هەر کە لێیان نزیک دەبۆوە هەموو پاڵیان بە یەکەوە دەدا و بەرگریان دەکرد. هەر بۆیە شێر لە هەر لاوە هروژمی دەبرد جووتێ شاخی بەرەو ڕوو دەبوونەوە. دوای ماوەیەک، ناکۆکی کەوتە نێوان گاجووتەکان و هەرکام چوونە گۆشەیەک مەزراکە بلەوەڕێن.

شێر لەم هەلە زێڕینە کەڵکی وەرگرت و دانە بە دانە گاجووتەکانی ڕاو کرد و خواردنی.



نوکتە: یەکگرتوویی هۆکاری سەرکەوتنە و ناکۆکی هۆکاری شکستە.

کورد دەڵێ: "برا لە پشت برا بێ مەگەر قەزا لە لای خودا بێ".




# قازی هێلکەزێڕ

بەیانییەکی زوو جووتیارێک چووە ناو مەزراکەی بۆ ئەوەی خواردن بدا بەو قازەی تازە کڕیبووی بەڵام بە سەرسووڕمانەوە، هێلکەیەکی زەرد و بریقەداری لە ژێر قازەکەدا بینی. کاتێ هێلکەکەی هەڵگرت سەیری کرد وەک قورقوشم قورسە. جووتیار پێی وابوو فێڵە و هێلکەکەی تووڕ هەڵدا. بەڵام دواتر پەشیمان بۆوە. هێلکەکەی هەڵگرتەوە و بردیەوە بۆ ماڵ. زۆری پێ نەچوو تێگەیشت هێلکەکە زێڕی پوختە. لەو ڕۆژە بە دواوە هەموو ڕۆژێک قازەکە هێلکەیەکی زێڕی دەکرد و جووتیارەکە دەیفرۆشت. پاش ماوەیەک جووتیار ئێجگار دەوڵەمەند ببوو بەڵام تەماحێک سوار سەری بوو. ئەو وای بیر کردەوە کە هەموو هێلکەکانی ناو سکی قازەکە یەکجێ بە دەست بێنێ. هەر بۆیە قازەکەی سەربڕی. بەڵام لە سکی قازەکەدا هیچی نەدۆزیەوە.

نوکتە: تەماحکار پارووی گەورەتر لە دەمی هەڵدەگرێت.

کورد دەڵێ: تەماح گیایەکی پیسە.

# منداڵۆچکەی شوان

ڕۆژگارێ منداڵۆچکەیەک شوان بوو. مەڕەکانی دەبردە لاپاڵی کێوەکان دەی لەوەڕاندن. ڕۆژێک زۆر بێتاقەت بوو بڕیاری دا کەمێک سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. بەرەو ناو دێ هەڵات و هاواری کرد: "گورگ هات! گورگ هات!"

کە خەڵکی ئاوایی، هاواری منداڵەکەیان بیست، بە دەمیەوە هاتن هەتا یارمەتی بدەن. بەڵام زۆری پێنەچوو زانیان کوڕەکە درۆی کردووە. منداڵۆچکە ئەو کارەی زۆر پێ خۆش بوو، ڕۆژی دواتریش هەروای کرد. خەڵکی ئاوایی دووبارە بە دەمیەوە هاتن، بەڵام کاتێ زانیان دووبارە درۆی کردوە، بە تووڕەییەوە گەڕانەوە ئاوایی.



چەند ڕۆژ لەوە دوا بەڕاستی گورگ کەوتە گیانی مەڕی شوانەکە. منداڵۆچکە زۆر ترسا و بەرزتر لە جاران هاواری کرد " گورگ هات، گورگ هات". بەڵام ئەم جارە خەڵکی ئاوایی بە هیچ جۆرێک بڕوایان پێ نەکرد و وایانزانی وەک جاران فریویان دەدات. بەم جۆرە گورگ زۆربەی مەڕەکانی کەلەلا کرد و کەسیش بە هانای شوانە درۆزنەکەوە نەهات.



نوکتە: کەس بڕوا بە درۆزن ناکات ئەگەر چی قسەی ڕاستیش بکات.

کورد دەڵێ: درۆزن یەک جار نان دەخوات.




# قەلەڕەشە و سەدەف

ڕۆژێک قەلە ڕەشەیەک سەدەفێکی دۆزیەوە، ویستی بیخوات. بەملاولایدا ئەدا تا بتوانێ گۆشتی ناوەکەی دەربهێنێ. خەریکی دەرهێنانی بوو قالاوێک بینی. قالاو گوتی: وا نابێت، دەبێ لە ئاسمانەوە بیخەیتە خوارەوە و بە بەردێکیدا بدەی، دەبێ بە عاقلانە ئەو کارە بکەیت. قەلە ڕەشە حەوا کەوتە ئاسمان و سەدەفەکەی بە بەردێکدا دا. سەدەفەکە هەلوەشا و گۆشتەکەی دەرهات. بەلام پێش ئەوەی قەلەڕەشەکە بیگاتێ قالاو گۆشتەکەی تاو دایە و هەلفڕی.

نوکتە: زۆر کەس تەنیا بۆ قازانجی خۆیان ئامۆژگاری کەسانیتر دەکەن.

# ئەسپ و شێر



شێرێکی پیر هەبوو حەزی لە گۆشتی ئەسپ بوو. گۆشتی ئەسپ ببووە خەیاڵی شەو و ڕۆژی. زۆر جار هەوڵی دابوو ئەسپێک ڕاو بکات بەڵام ئەو ئەسپە زۆر وریا و زیرەک بوو. هەموو جارێک فێڵی لە شێر دەکرد. سەرئەنجام ڕۆژێک شێر پیلانێکی دارشت. جل و بەرگی مامۆستای لەبەر کرد و چوو بۆ ئەو قوتابخانەی ئەسپ دەرسی لێدەخوێند. هەر کە شێر چووە قوتابخانەکەوە، ئەسپ بە بۆن شێری ناسیەوە. کەمێ دواتر کە شێر بە دەور و بەری ئەسپدا دەگەڕا، ئەسپەکە بەرز حیلاندی شێر داچڵەکاو لە ئەسپ تووڕە بوو. ئەسپ گوتی:

"چەند ڕۆژ لەوەبەر کاتێ بە ناو بێشەڵاندا دەگەڕا، چەقڵێک لە پێی ڕاچووە و بەو چەقڵەوە دەناڵێ". شێر گوتی: " ئادەی قاچت بێنە با چەقڵەکەت بۆ دەرهێنم". هەر کە شێر چەماوە سەیری قاچی ئەسپەکە بکات ئەسپ زۆر بە توندی لەقەیەکی لە دەمی شێر داو لە قوتابخانە دەرپەڕی و خۆی دەرباز کرد.



نوکتە: ئەوەی بیهەوێ زیان لە خەڵکی بدات خۆشی تووشی زیان دەبێت.

کورد دەڵێ: دەعبای زیرەک بە دەندووک پێوە دەبێت.

# ئەسپ و کەر



[illegible] زۆر بە ڕەخت و زینەکەی خۆی دەنازی. ڕۆژێک لە ڕێگادا تووشی کەرێک بوو. کەرەکە بارێکی قورسی لە سەر پشت بوو زۆر بە هێواشی ڕێی دەکرد. ئەوەندەی پێ نەچوو ئەسپ لە هێواش ڕێکردنی کەر قەڵس بوو گوتی: ناتوانی تۆزێک خێراتر ڕێ بکەی؟ نەکا بتهەوێ لەقەیەکت لێبدەم. کەر بێئەوەی وڵامی بداتەوە هەر وا بە هێواشی درێژەی بە ڕێکردنەکەی دا. چەند ڕۆژ لەوە بەدوا کەر هەمان ئەسپی بینی لە کێڵگەیەکدا کاری دەکرد. ئەسپ گارییەکی پڕ لە باقە گیای بە هێواشی ڕادەکێشا. کەر پێی پێکەنی و گوتی: ئێستا تۆ لە هەمان دۆخدای کە چەند ڕۆژ لەمەبەر منی تێدا بووم.

نوکتە: هەندێ جار هەتا لە دۆخی کەسێکدا نەبین لە حاڵی ئەو کەسە تێناگەین.

کورد دەڵێ: هەتا نەتدا لە تەبەق نەتگوت ئەڵڵاهوسەدەق.



# شەمشەمەکوێرە، باڵندە و ئاژەڵەکان



ڕۆژگارێک لە نێوان باڵندەکان و ئاژەڵەکاندا هەرایەکی گەورە ساز بوو. بە تەنیا شەمشەمەکوێرە بێلایەن مایەوە، باڵندەکان چوونە لای و گوتیان ببەرە دەستەی ئێمە، شەمشەمە کوێرە گوتی: "ناتوانم، چونکە من ئاژەڵم،" ماوەیەک دواتر چەند ئاژەڵێک چوونە لای، گوتیان: دەبیە دەستەی ئێمە؟ شەمشەمە کوێرە گوتی: "ناتوانم، چونکە من باڵندەم." دوا ماوەیەک هەر دوولا ئاشت بوونەوە و هەرا دوایی هات. کاتێ هەموو شتێک ئاسایی بۆوە شەمشەمەکوێرە چووە لای باڵندەکان تا بەشداری ئاهەنگەکەی ئەوان بکات، بەڵام باڵندەکان پشتیان تێکرد، ناچار لەوێ ڕۆیشت. کاتێکیش چووە لای ئاژەڵەکان وەخت بوو بیکوژن و ئەگەر زوو هەڵنەفڕیبا خراپی بەسەر دەهات. بەمشێوە، شەمشەمەکوێرە، لە هیچ دەستەیەکدا قەبوول نەکرا و بە تاقی تەنیا مایەوە.

نوکتە: کەسێک تەنیا هەر لە خەمی خۆیدا بێت لە کۆتاییدا بە تەنیا دەمێنێتەوە.

کورد گوتی: بە وشترملیان گوت باربەرە گوتی: من مەلم گوتیان هەڵفڕە وتی وشترم.

# ئەسپی بێبەزەیی



سەر لە بەیانی ڕۆژێک کەر و ئەسپ بە شەقامێکدا دەڕۆیشتن. ئەسپ بارێکی سووکەڵەی پێ بوو، بەڵام باری کەر زۆر قورس بوو. دوا ماوەیەک کەر کەوتە سەرسم دان و بەم لاو لادا کەوتن. داوای لە ئەسپ کرد یارمەتی بدات. کەر پاڕایەوە و گوتی: "دۆستی ئازیزا زەحمەت نەبێ نیوەی بارەکەم هەڵبگرە، دەنا ناتوانم بگەمە شار".

بەڵام ئەسپ قایل نەبوو، کەمێ دواتر کەر لە ژێر بارەکەدا سەقەت بوو.

زۆری پێ نەچوو ئەسپ تێگەیشت کە چەند بە هەڵەدا چووە، چوونکە ناچار کرا سەرەڕای باری کەرەکە، کەوڵی کەرەکەش هەڵبگرێ.



نوکتە: دەبێ بۆ چارەسەری کێشەی هاوڕەگەزەکانمان یارمەتیان بدەین.

کورد دەڵێ: هەر چاکە چاکە.



# ڕێوی و مەیموونی بێ‌کلک

مەیموونێک بوو کلکی نەبوو، هەر بۆیە زۆر بێتاقەت بوو. ڕۆژێک چووە لای ڕێوی. ڕێوی کلکی تووکن ودرێژبوو. مەیموون لە ڕێوی پاڕاوە لەتێکی بچووکی کلکی خۆی بداتێ بۆ ئەوەی پشتی قوونی پێ داپۆشێ. مەیموون گوتی: "کلکی تۆ ئەوەندە تووکن و درێژە ئەگەر تەنانەت نیوەشی ببڕی هیچی لێ‌دیار نیە."

ڕێوی جوابی داوە " باشە، لەوانەیە وا بێت، بەڵام تەنانەت یەک مووشت پێ نادەم، باشتر وایە بزانی کلکی ڕێوی بۆ داپۆشینی پشتە قوونی مەیموون دروست نەکراوە.

نوکتە: سروشت هێندێک یاسای سەختی تێدان کە نەگۆڕن.

# ڕێوی و بەور

ڕۆژێک تیرهاوێژێکی کارامە هاتە ناو دارستان. ئەو بە تیر و کەوانەکەی ئاژەڵێکی زۆری ڕاو کرد. ئاژەڵەکانی دارستان ئەوەندە ترسابوون هەموو پەنایان بردە بێشەڵانە چڕەکانەوە. لەو کاتەدا بەور بە ئاژەڵەکانی دیکەی گوت "دەتوانم بە تاقی تەنیا دوژمنەکەتان شکست پێ بهێنم و بە ئازایەتیەکانی خۆم تۆڵەی هەموو کوژراوەکان بکەمەوە".



لەو کاتەدا کە بەور خۆی ئامادە دەکرد کتوپڕ تیرێک چەقیە پەراسوی و بەور بە توندی نەڕاندی هەوڵی دا تیرەکە بە ددانی دەرکێشێ بەڵام بێ سوود بوو.

لەو کاتەدا ڕێوییەک لێی نزیک کەوتەوە و پرسی " چی ڕووی داوە"؟

بەور وەڵامی داوە " پێم وابوو کەس دەرەقەتم نایەت بەڵام بە هەڵەدا چووم، تیر توانی لە بەدەنم ڕۆچێ. ئێستا تێگەیشتم تەنانەت ئەوانەش کەس دەرەقەتیان نایەت، زۆر خاڵی لاوازی‌یان هەیە".

نوکتە: تەنانەت لە قایم‌ترین زرێشدا خاڵی لاواز هەیە.

# گاجووت و بزن



گاجووتێک لە چنگ شێر هەڵ هاتبوو؛ چوو لە ئەشکەوتێک خۆی حەشار بدات بەڵام هەر کە چووە ژوور، بزنەکێوییەک بە شاخە تیژەکانیەوە پەلاماری دا. گاجووت بە بزنی گوت: ئەمن هیچ لە تۆ ناترسم بەڵام لەو شێرە دەترسم کە لە دەرەوە بەدوامدا دەگەڕێت. بوەستە شێر لێرە دوور بکەوێتەوە ئەوسا هێزی خۆمت نیشان دەدەم.

نوکتە: پیلە گرتن بە لێقەوماوان کارێکی زۆر قێزەونە.



# هەڵۆ و ڕێوی



هەڵۆیەک و ڕێوییەک هاوڕێ بوون. هەڵۆ لەسەر دارێکی بەرز هێلانەی کردبوو، ڕێویش لە کلۆری دارەکەدا کولانەی ساز دابوو. ڕۆژێک هەڵۆ هیچی دەست نەکەوت بیبات بۆ جوچکەکانی کتوپڕ چاوی بە بێچووەکانی ڕێوی کەوت. بێچووە ڕێوییەکان بە تەنیا بوون و ڕێوی لەو دەور و بەرانە نەبوو، هەڵۆ خێرا داهاتەوە و بێچوە ڕێوییەکی گرت و بردی بۆ جوچکەکانی. کاتێ ڕێوی گەڕایەوە و پێی زانی زۆر خەمبار بوو بەڵام هیچی لەدەست نەدەهات. چارەنووس دەوری خۆی گێڕا. ڕۆژێک خەڵکی ئاوایی جێژنیان گرتبوو لەسەر ئاور گۆشتیان دەبرژاند. هەڵۆ داهاتەوە و چەند کوتە گۆشتی ڕفاند و بردی بۆ جوچکەکانی. پشکۆیەک بە کوتە گۆشتێکەوە بوو، لە ناو هێلانەی هەڵۆدا با لێی دا و گەشایەوە و هێلانەکەی سووتا. جوچکە هەڵۆکان هێشتا فێرە فڕین نەبووبوون بە نیمچە سووتاوی لە هێلانەکەوە دەکەوتنە خوار و لەبەر چاوی هەڵۆدا ڕێوی دانە دانە دەیخواردن.

نوکتە: بە جۆرێک لە تەک کەسانی تردا ڕەفتار بکە کە پێت خۆشە وا ڕەفتارت لەتەکدا بکرێت.

کورد دەڵێ: دەرگای کەس مەڕەقێنە با دەرگات نەڕەقێنن.






# پشیلە و کەڵەشێر

ڕۆژێک پشیلە، کەڵەشێرێکی گرت. بۆ ئەوەی بیخوات دەستی کرد بە بیانوو هێنانەوە. پشیلە تۆمەتی لە خەو کردنی خەڵکی دایە پاڵ کەڵەشێر و پێی گوت: "دەزانی دەمەو بەیان ئەوەندە دەخوێنی خەڵقی لە خەو دەکەیت و ناهێڵی کەس ئاسوودە بێت." کەڵەشێر گوتی: "من لە پێناو سوود گەیاندن بە خەڵک بەیانیان دەخوێنم، بۆ ئەوەی هەستن و لە کارەکانیان دوا نەکەون." پشیلە گوتی: "تەنانەت ئەگەر ئەو کارەت زۆر پیاوەتیشی بۆ خەڵک تیدابێت، من برسیمە و دەتخۆم." دوایە ملی کەڵەشێری گرت و خواردی.

نوکتە: بە درۆ خستنەوەی کەسێک کە لە خۆڕا بیانووت پێ دەگرێت بێ سوودە.

# ...دەی ڕاوکەر و کۆترەکان

باڵندەیەکی ڕاوکەر هەموو ڕۆژێک هروژمی دەکردە سەر کۆترەکان و ئازاری دەدان. کۆترەکان چوونە لای واشە و داوای یارمەتی‌یان لیَ‌کرد. واشە بە دەمیانەوە هات و لەو کاتەدا کە باڵندە ڕاوکەرەکە شاڵاوی بۆ کۆترەکان هێنا، واشە پەلاماری دا و کوشتی. ئیتر کۆترەکان بوون بە هاواڵی واشە. پاش ماوەیەک واشە پیر بوو نەیدەتوانی پارێزگاری

لە کۆترەکان بکات، کاتێ کۆترەکان تێگەیشتن واشە توانایی نەماوە چاوی واشەیان دەرهێنا.

نوکتە: کەسانێک هەن جوابی چاکە بە خراپە دەدەنەوە.



# مێروولە و کۆتر



ڕۆژێک مێروولەیەک چووە قەراخ ڕووبار ئاو بخواتەوە، بەڵام کەوتە ڕووبارەوە و ئاو بردی. کۆترێک لە سەر دارێک هەڵنیشتبوو، چاوی لەو ڕووداوە بوو گەڵایەکی لە دارەکە کردەوە و لە نزیک مێروولەکە خستیە ڕووبارەوە، مێروولەکە ئەوەندەی نەمابوو بخنکی بەڵام خۆی خستە سەر گەڵاکە و بە سەلامەت گەیشتە قەراخی ڕووبارەکە. کەمێک پاش ئەوە، ڕاوچیەک هات و لە ژێر دارەکەدا وەستا. کۆترەکەی چاو پێ کەوت و داوەکەی ڕاخست تا کۆترەکە بگرێت. مێروولە تێگەیشت ڕاوچی بە نیازە کۆترەکە ڕاو بکات خێرا گازێکی لە قاچی ڕاوچی گرت. ڕاوچی قیژاندی و داوەکەی فرێدا. کۆترەکە دەنگی ڕاوچی بیست و هەڵفڕی.



نوکتە: ئەگەر چاکە بکەی چاکەت دەدرێتەوە.

کورد دەڵێ: کەڵک لە کەڵکی ئاوسە.




# مێشەکان و کووزوی هەنگوین

کووزوێک هەنگوین لە ژوورێکدا سەرەو نخوون بۆوە. چەند مێشێک دەورەیان دا. مێشەکان لەسەر هەنگوینەکە نیشتنەوە و دەستیان کرد بە هەنگوین خواردن. بەڵام کەمی دواتر وەها قاچیان بە هەنگوینەکەوە نووسابوو کە نەیاندەتوانی هەڵفڕن و بە ناو هەنگوینەکەدا ڕۆچوون و خنکان. مێشوولەیەکیان کە بە گیانەڵڵاوە بوو گوتی: ئێمە چەندە نەفامین! بۆ تۆزێک هەنگوین خۆمان بە کوشتدا.

نوکتە: هێندێ جار خۆشیەکی کەم و کورتخایەن بە کوشتمان دەدات.




# ڕێوی و تاوس

ڕۆژێک تاوسێک لەسەر لقی دارێک هەڵنیشتبوو. ڕێوییەکی فێڵباز بەوێدا تێپەڕی. تاوسی بینی و لەبەر خۆیەوە گوتی: "چ خواردنێکی خۆشە! چۆن دەتوانم بیگرم؟ دەبێ فریوی بدەم و بیخەمە داو." ڕێوی لە تاوس نزیک کەوتەوە و گوتی: "هاوڕێی ئازیز، تۆ چەند جوانی! چاوەکانت زۆر گەشاوەن! پەڕ و باڵت چەند ڕەنگاو ڕەنگن! دڵنیام ئەگەر چاولێک بنێی زۆر جوانتر دیاردەکەوی."

تاوس زۆر شادمان بوو. قسەی ڕێوی کاری تێکرد و چاوی لێک نا. ڕێوی گورج خۆی بۆ هەڵدا و ملی تاوسی گرت، تاوس خەریک بوو دەخنکا. بە کۆکە کۆک گوتی " هاوڕێی ئازیز! تکایە ئاواتێکی بچووکم هەیە بەدی بهێنە، پێش ئەوەی بمخۆیت جارێک بانگم بکە."

هەر کە ڕێوی دەمی کردەوە بانگی بکات، تاوس هەڵفڕی. ڕێوی کە زانی تاوس لە دەست دەرچووە گوتی: ئای لەو عەقڵەی من! کەی پێویست بوو بانگی بکەم! تاوس هاواری کرد: "منیش بێ عەقڵ بووم. کاتێ کە هیچ خەوم نەدەهات، بۆچی چاوم لێک نا؟"

نوکتە: زۆر کەمن ئەوانەی فریوی زمانی لووس ناخۆن.

# کەڵەکێوی و بێچوە کەڵ





کەڵەکێویەکی پیر سەردەمانێک سەرکردەی ڕەوەکەی بوو. هەموو هاوەڵەکانی ڕێزی ئازایەتییەکەیان دەگرت، ئەویش ڕاهاتبوو فیز بەسەر ئەوانی تردا لێبدا. بێچوە کەڵێک پێیزانی کە زۆر لە حەپەی سەگ دەترسێ. چەند ڕۆژ دواتر بێچوە کەڵ، چووە لای و پرسی، جەنابت بەو هەموو لێوەشاوەیی و ئازایەتیەوە بۆچی کە حەپەی سەگ دەبیستی ڕادەچڵەکی و ڕادەکەی؟ کەڵەکێوی ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی: ئەوەی پێت زانیوە وایە. لە ڕاستیدا من زۆر بە هێز و بەتوانام و پێم وایە هەرگیز نابێت خیرەت و ئازایەتیم لە دەست بدەم، بەڵام بە داخەوە هەر کە حەپەی سەگەل دەبیستم دڵم دادەخورپێ و خۆم پێ ڕاناگیرێ و ڕادەکەم.

نوکتە: فیز لێدان کاری کەسانی ترسنۆکە.

# ئەسپ و کەڵەکێوی

سەردەمانێک ئەسپێک، لە ناو لەوەڕگەیەکی گەورەدا دەژیا و خۆی بە خاوەنی ئەو شوێنە دەزانی. ڕۆژێک کەڵەکێوییەک هاتە ناو هەرێمەکەیەوە. ئەسپ بە ناچاری لەوەڕگەکەی لە تەکدا بەش کرد بەڵام لە ناخەوە ئەم بابەتە نیگەرانی کردبوو. ڕۆژێ پیاوێ هاتە لەوەڕگاکە. ئەسپ داوای لێ‌کرد، بۆ تۆڵەسەندن لە کەڵەکێوی هاوکاری بکات. کابرا گوتی: ئەگەر بهێڵی سوارت ببم، هاوکاریت دەکەم. ئەسپ قەبووڵی کرد و ڕێگەی‌دا کابرا سواری ببێت، بەڵام لەو کاتەوە، ئەسپ بووە کۆیلەی کابرا و هەرگیز نەیتوانی تۆڵەی خۆی بکاتەوە.

نوکتە: سەربەستی زۆر لەوە بە نرخ‌ترە کە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە کیسی بدەیت.

# کەر و سیسرۆکە





ڕۆژێک کەرێک دەنگی سیسرۆکەی هاتەگوێ. کەر دەنگی سیسرۆکەکانی زۆر پێ خۆش بوو، ئاواتە خواز بوو بتوانێ وەک ئەوان بجریوێنێ. چەند ڕۆژ دواتر کەر چوو بۆ لایان و گوتی: هاوڕێیان ئێوە دەنگتان زۆر خۆشە بەڵام کەس زەڕەی منی پێخۆش نیە، تکایە پێم بڵێن ئێوە چی دەخۆن دەنگتان ئاوا خۆشە؟ سیسرۆکەکان گوتیان: " ئێمە ئاونگ دەخۆینەوە " کەر پێی وابوو دەتوانێ تەنیا بە خواردنەوەی ئاونگ بژی و دەنگی خۆش ببێت بەڵام زۆری نەخایاند لە برسان مرد.

نوکتە: یاساکانی سروشت نەگۆڕن.

کورد دەڵێ: هەر ڕێگە و بۆ ڕێبوارێک.





# ڕەز و بزنەکێوی

ڕۆژێک چەند ڕاوچی چوون بۆ ڕاو. بزنەکێویەکیان ڕاو نا، بەڵام بزنەکێوی خۆی‌خزاندە ناو ڕەزێک و لەبن مێوەکاندا خۆی حەشار دا. بزنەکێوی ماوەیەک بێ‌چرپە مایەوە، بەڵام هەر کە وای‌زانی لە مەترسی ڕزگاری بووە، دەستی کرد بە خواردنی گەڵا مێوەکان. ڕاوچیەکان خشپەی گەڵاکانیان بیست و کەوتنە گەڕان بە دوای بزنەکێویدا. زۆری پی‌نەچوو بزنەکێویەکەیان دۆزیەوە و بە تیر ئەنگاوتیان. بزنەکێوی، لەسەرە مەرگدا لەبەر خۆیەوە گوتی: حەقی خۆم بوو ئاوام لی‌بی، چونکە گەڵای دارێکم خوارد کە حەشاری دابووم. بەم‌کارە، ڕێگای لەناو چوونی خۆمم خۆش کرد.

نوکتە: بی ئەمەگی دەردەسەرە.

کورد دەڵی: کانییەک کە ئاوی لی دەخۆیتەوە، بەردی تی‌مەهاوێژە.




# گورگ و شێر

گورگێک، بەرخێکی ڕفاند و زۆر بە کەیفەوە بەرەو ماڵ گەڕایەوە. لە ڕێگادا تووشی شێرێک بوو. شێر بە تامەزرۆییەوە سەیری بەرخەکەی کرد و ئەوەندەی یەک و دوو بەرخەکەی لە گورگ سەند و لێی‌دا ڕۆی. گورگ تاسا و هاواری کرد "ئەوە زۆر ناپیاویە ئەو شتە ببەی کە حەقی منە."

کاتێ شێر ئەمەی بیست گوتی: "مەبەستت ئەوەیە من بە ناحەق بەرخەکەم لە تۆ ساندووە؟ بەلام ئایا دەکرێ بپرسم کێ ئەو حەقەی بە تۆ دا ئەم بەرخە بڕفێنی؟"

نوکتە: ئەو شتەی بە ناپیاوی بە دەستی بێنی بە ناپیاوی لێت‌دەستێنن.

کورد دەڵێ: ماڵی با بە با دەڕوا.

# دوو بـزن



ڕۆژێک دوو بزن هاوکات گەیشتنە ئەم سەراوسەری پردێکی باریک. هەرکام لە سەری خۆیەوە ڕێ کەوتن و لە ناوقەدی پردەکەدا پێک گەیشتن. کەسیان لە سەر ڕێی ئەوی‌تر لانەچوون و پردەکە هێندە پان نەبوو بەپاڵ یەکدا ڕابوورن. بۆیە بە شەڕ هاتن، ئەوەندەیان لەیەکدی دا، پردەکە پچڕا و هەردووکیان کەوتنە چەمەکەوە و خنکان.

نوکتە: هەندێ جار تەسلیم بوون لەوەی باشترە کە تووشی کارە سات ببین.

# شێر و ڕێوی





شێر و ڕێوی بڕیاریان دا وێکڕا بچنە ڕاو. ڕێوی گوتی لە پەیدا کردنی نێچیردا یارمەتیت دەدەم. شێر گوتی منیش نێچیرەکە ڕاو دەکەم. بەم شێوە ماوەیەک ڕێوی نێچیری پەیدا دەکرد و شێر تاوی دەدایە و دەیگرت، بەڵام زۆری نەخایاند ڕێوی لەم دۆخە نیگەران بوو چونکە پشکی ئەو لە نێچیرەکە ڕۆژ بە ڕۆژ کەمتر دەبوو، هەر بۆیە بڕیاری دا ئیتر لە پەیدا کردنی نێچیردا یارمەتی شێر نەدات. لەوە بەدوا شێر کە ناچار بوو بۆخۆی نێچیر پەیدا بکات، لە ڕاوکردندا هیچی پێنەدەکرا. ڕێویش لەو باشتر نەبوو. ڕۆژێک ڕێوی بۆخۆی بە تەنیا چوو بۆ ڕاو و کەوتە ناو داوی ڕاوچیەک، بەم شێوەیە لە ئاکامدا تێگەیشت کە کەم خواردن لەوە باشترە کە خۆی ببێتە نێچیر.

نوکتە: خەیاڵپڵاو زۆر جار دەبێتە قاتڵی گیان.

کورد دەڵێ: کەس بەخەیاڵ نابێ بە ماڵ.



# نۆبەن و گاجووت

ڕۆژێک نۆبەنێک، گاجووتێکی بینی کە جووتیار ژێر نیرو ئامووری خستبوو. گاجووت بە سەختی کاری دەکرد و زەوی دەکێڵا. کاتێک نۆبەن بە لایدا تێپەڕی، گاڵتەی بە ئەو چارە نووسە ناڵەبارەی گاجووت کرد. بەڵام گاجووت بێدەنگەی لێکرد و بێوەڵامدانەوە خەریکی کاری خۆی بوو. ماوەیەکی کەم تێپەڕی و کاتی جێژنی خەرمان هات. جووتیار گاجووتی لەژێر نیر دەرهێنا و نۆبەنی بە پەتێک بەستەوە، ئەوجار نۆبەنی بردە سەر خەرمان تا بۆ قوربانی کردن سەری ببڕێت. کاتێک گاجووت نۆبەنی بەو حاڵە پەریشانەوە بینی گوتی: لەبەر ئەوەی دەیانهەویست بتکەنە قوربانی بەر هەڵدایان کردبوویت و لێگەڕابوون ئاوا بە ئاسوودەیی بسووڕێیتەوە.

نوکتە: خۆت لەو کەسانە بە دوور بگرە کە هەر کات بیانهەوێت دەتوانن لە ناوت بەرن.

# ئاسک و بەور



ئاسکێک لەتاو ڕاوچیان هەڵات و پەنای بۆ ئەشکەوتێک برد. بەورێک کە لەو ئەشکەوتە دا دەژیا کاتێک ئاسکی بینی خۆی لە تاریکیدا حەشار دا و لیگەڕا تا ڕاوچیەکان ڕۆیشتن. ئاسک کاتێ ویستی دەمێک وەحەسێت، بەور خۆی هەڵدا و لە تاریکی هاتە دەر و تاوی دایە ئاسک و لەت و پەتی کرد. ئاسک پێش ئەوەی بمرێت لەبەر خۆیەوە گوتی: ئای لەو چارەنووسە ڕەشەی من! هەوڵم دا خۆم لە دەست ڕاوچیان قوتار بکەم. بەڵام بەر چنگی دەعبایەکی دڕندە کەوتم.

نوکتە: دەبێ ئاگادار بین کاتێ هەڵاتن لە مەترسیەک، لە مەترسیەکی خراپتر نەکەوین.

کورد دەڵێ: لە ترسی سەگ کەوتە دەمی گورگەوە.



# جووتیار و لەقلەق





جووتیارێک لە ناو کێڵگەکەیدا کە تازە دایچاندبوو، بۆ ئەو قورینگانەی تووی مەزراکەیان دەخوارد، داوی نایەوە. ڕۆژێک لەقلەق کەوتە داوەکە و قاچی شکا. دواتر جووتیار هات و لەقلەقی لە ناو داوەکە دا بینی. لەقلەق بە بینینی جووتیار کەوتە پاڕانەوە کە بەرهەڵدای بکات، هاواری دەکرد: "تکایە یارمەتیم بدە با بڕۆم قاچم شکاوە و سەرەڕای ئەوە من قورینگ نیم، لەقلەقم!"

جووتیار بە دەنگی بەرز پێکەنی و گوتی: "لەوانەیە ئەوەی تۆ دەیڵێیت ڕاست بێت، بەڵام من تۆم لە ناو قورینگە دزەکاندا گرتووە، کەوایە دەبێ بە هۆی هاوڕێیەتی کردنی ئەوان، بمریت."

نوکتە: دۆستایەتی کەسانی نەگبەت مەکە.

کورد دەڵێ: بەلای ئاسنگەر دا بڕۆی پرینچکت پێ هەڵدەپەڕێ.





# شێر و دوڵفین

ڕۆژێک شێر لە قەراخ دەریادا پیاسەی دەکرد. دوڵفینێک کە سەری لە ئاوەکەوە دەرهێنا بوو، سەرنجی ڕاکێشا. شێر و دوڵفین قەدەرێک وتوویژیان کرد و دواتر ڕێکەوتنێکیان بەست، بە پێی ئەو ڕێکەوتنە شێر دەبووە پاشای گیانلەبەرانی وشکانی و دوڵفینیش دەبووە فەرمانڕەوای هەموو دەریا. ئەو دووە بوونە هاوڕێی یەکدی.

ماوەیەک لەوەدوا کاتێک شێر لە تەک کەڵەکێوییەکی گەورەدا، بەشەڕ هاتبوو، داوای یارمەتی لە دوڵفین کرد. دوڵفین ئامادە بوو یارمەتی شێر بدات بەڵام نەیدەتوانی خۆی بگەیەنێتە وشکانی. شێر دوڵفینی بە خەیانەت تۆمەتبار کرد. دوڵفین گوتی: نەخێر هاوڕێ! لە جیاتی من سروشت تۆمەتبار بکە. هەرچەند سروشت لە دەریادا هێزێکی تەواوی بە من بەخشیوە، بەڵام ڕێگەی وشکانی لە من تەنیوە.

نوکتە: بەر لە بەستنی هەر ڕێکەوتنێک لێکدانەوەی تەواوی بۆ بکە.

کورد دەڵێ: بەغدا بۆ پیاوی فەقیر دوورە.

# گورگ و مالۆس



گورگێک، مالۆسێکی بریندار بینی کە لەسەر عەرز کەوتبوو. گورگ پێشنیاری پێکرد رێگە بدات ئاگاداری بزەلەکانی بکات، بەڵام مالۆس سپاسی ئەو سۆز و خۆشەویستییەی گورگی کرد و گوتی: ئەگەر خۆت لە بزەلەکانم بە دوور بگری، زیاتر مەمنوونت دەبم.

نوکتە: وریای چاکە و بەزەیی دوشمنەکانت بە.

کورد دەڵێ: باوەڕ بە پێکەنینی ستەمکار مەکە.



# واشە و بولبول و ڕاوچی



واشەیەک، لە کاتی شوێن کەوتنی کەروێشکێکدا، هێلانە بولبولێکی بینی. جوچکە بولبولەکان لە ناو هێلانەکەدا چاوەڕوانی دایکیان بوون خواردنیان بۆ بهێنێت. کاتێ بولبول گەڕایەوە واشەی بینی دەور و خولی هێلانەکەی دەدات و جوچکەکانی لە ترسان دەقیژێنن. بولبول لەبەر واشە پاڕایەوە و تکای لێکرد بەچکەکانی نەخوات، واشە گوتی: ئەگەر ئاوازێکی خۆشم بۆ بخوێنی تکات دەگرم.

بولبول هەموو خیرەتی خۆی کۆ کردەوە کە ئاوازێکی خۆش بخوێنێت بەو حاڵەش دەنگی لەرزا و ئاوازێکی خەماوی خوێند. واشە هاواری کرد ئاوازەکەت هیچ خۆش نەبوو. ئەمجار جوچکەیەکی بە دەندووک گرت و قووتی دا. ڕێک لەو کاتەدا ڕاوچیەک بە هێواشی خۆی خزاندە بن دارەکە و تیرێکی گرتە واشە. تیر هەوای قەڵەشتەوە و بە سنگی واشەدا ڕۆچوو واشە کەوتە سەر عەرز و مرد.

نوکتە: ئەوەی دەیهەوێ کەسانیتر بخاتە داو، بۆخۆی لە داو دەکەوێ.

کورد دەڵێ: هەرکەس چاڵ بۆ خەڵکی هەڵکەنێ خۆی تێی دەکەوێت.

# پەری و دارفرۆش



ڕۆژێک بەرەبەیان، دارفرۆشێک لە قەراخ چۆمێکدا داری وشکی دەکردەوە، کتوپڕ هەڵخلیسکا و تەورەکەی کەوتە گۆمێکەوە. دارفرۆش لە قەراخ گۆمەکە هەڵکوڕمابوو خەفەتی بۆ تەورەکەی دەخوارد، لەو کاتەدا پەرییەک کە لەو گۆمەدا دەژیا، لە بەر دەم دارفرۆش، دەرکەوت. پەری لە دارفرۆشی پرسی: "بۆچی خەمباری؟" دارفرۆش ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. پەری بەزەیی پێدا هات و خۆی بە ئاوەکەدا دا و دوای کەمێک بە تەورێکی زێڕینەوە هاتە دەر. لە دارفرۆشی پرسی:

"ئەمەیە تەورەکەت؟" دارفرۆش وەڵامی داوە:

"نەخێر، ئەو تەورە، تەوری من نیە".



پەری دووبارە خۆی بە ئاوەکەدا دا و بە تەورێکی زێوینەوە هاتە دەر و دووبارە پرسیاری کرد: "ئەمەیە تەورەکەت؟" دارفرۆش گوتی: "نەخێر، ئەوەشیان تەوری من نیە".

پەری، جارێکیتر خۆی بە ئاودا داو ئەمجارە تەورە ئاسنینەکەی دارفرۆشی هێنایە دەر. دارفرۆش بە بینینی تەورەکەی، گەشایەوە و لە ناخی دڵەوە سپاسی پەری کرد. پەری،

ئەوەندە پاکی و ڕاستگۆیی دارفرۆشی بەر دڵ کەوت کە سەرەڕای تەورەکەی خۆی، دوو تەورەکەی دیکەشی بە دیاری پێدا. دارفرۆش گەڕاویەوە ماڵ و ئەو بەسەرهاتەی بۆ دارفرۆشەکانیتریش گێڕایەوە. یەکێک لە دارفرۆشەکان کە پیاوێکی چاوچنۆک بوو، چووە قەراخ ئەو چۆمە تا بەختی خۆی تاقی بکاتەوە. ئەو خۆی بە دار کردنەوەوە خەریک کرد دواتر بە قەستی تەورەکەی خۆی خستە ناو گۆمەکەوە. پەری وەک جاری پێشوو دەرکەوت، کاتێ زانی دارفرۆش

تەورەکەی کەوتۆتە گۆمەکەوە، خۆی بە ئاودا دا و تەورێکی زێڕینی هێنا دەر، بەڵام بەر لەوەی پەری فریا بکەوێت شتێک بڵێت دارفرۆش هاواری کرد: "خۆیەتی! ئەوە تەورەکەی منە "

پەری فڕ و فێڵی دارفرۆشی بۆ دەرکەوت و ئەوەندە بێزار بوو نەک

تەورە زێڕینەکەی پێنەدا، بەڵکو ئامادە نەبوو تەورە ئاسنینەکەشی بۆ

دەر بهێنێتەوە.

نوکتە: ڕاستگۆیی باشترین تەگبیرە.

کورد دەڵێ: ڕاست بە، ڕاستیت دێتە ڕێ.




# سەگ و گوێدرێژ

پیاوێکی گەنج وێڕای کەر و سەگەکەی بۆ سەفەر چوو. دوای ماوەیەک ڕێ کردن ماندوو بوون و لایان دایە سێبەری دارێک وەحەسێن. کەرەکە بۆ لەوەڕ تۆزێک دوور کەوتەوە دواتر سەگەکەش برسی بوو، چووە لای کەر و داوای کرد برێک نانی لە بارەکەی بداتێ، بەڵام گوێدرێژ نانی بەش نەدا و گوتی: ڕاوەستە خاوەنەکەمان کە لەخەو هەستا نانت پێدەدات. کتوپڕ گورگێکی سامناک لە دارستان هاتە دەر و چاوی لە گوێدرێژ بڕی. گوێدرێژ زۆر ترسابوو، تکای لە سەگ کرد بحەپێنێت و گورگەکە دوور وەخات. بەڵام سەگ نەی حەپاند و گوتی: کاتێک خاوەنەکەمان لە خەو هەستا دێت و یارمەتیت دەدات.



نوکتە: ئەوانەی بەزەیان بە کەسانی تر دا نایەت لەوانەیە بێ بەزەیانە ڕەفتاریان لە تەک دا بکرێت.

کورد دەڵێ: خراپ خراپەی دێتە ڕێ.

# ڕاوچی و واشە



ڕۆژێک واشەیەک بۆ ڕاوەکۆتر دەچوو، بە ڕێکەوت لە داوی ڕاوچیەک کەوت. کاتێ ڕاوچی هاتە سەر داوەکە، واشە داوای لێ کرد بەرهەڵدای بکات. گوتی: تکایە لێمگەڕێ با بڕۆم، خۆ من هیچ ئازارێکم بۆ تۆ نیە. ڕاوچی گوتی: "کۆترەکانیش هیچ ئازارێکیان بۆ تۆ نیە، بەڵام هەموو ڕۆژێک بۆ خواردن ڕاویان دەکەیت". ئەمجار واشەی گرت و سەری بڕی.

نوکتە: ئەوانەی لە تەک کەسانیتردا بێ بەزەیین لە بەرانبەردا بێ بەزەییانە هەڵس‌وکەوتیان لە تەکدا دەکرێتەوە.

# یەکانە و ڕێوی



ڕێوییەک لە دارستاندا پیاسەی دەکرد. یەکانەیەکی بینی بڕەکانی لە قەدی دارێک هەڵدەسوێ. ڕێوی لەم کارەی یەکانە سەری سووڕما و لێی پرسی "خۆ هیچ مەترسیەک لە ئارا دا نیە، بۆچی بڕەکانت دەسووی؟ لەم دەور و بەرانە نە ڕاوچی لێیە و نە تولە و تانجی".

یەکانە وەڵامی داوە: بۆیە بڕەکانم دەسووم چون دەزانم کاتی بەکارهێنانیان لە بەرانبەر دوژمندا فریای تیژ کردنەوەیان ناکەوم".

نوکتە: چاکتر وایە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی کێشەکان هەمیشە ئامادە بین، بۆ ئەوەی دواتر پەشیمان نەبینەوە.





# چۆلەکە و کەروێشک





بەرەبەیانی ڕۆژێک، کاتێک چۆلەکە خەریکی خواردن بوو، دەنگی هاواری کەسێکی بیست. چۆلەکە بەم لاولایدا ڕوانی و چاوی بە کەروێشکێک کەوت کە گیرۆدەی چنگاڵی هەڵۆیەک ببوو. بەرەو کەروێشک هەڵفڕی و گوتی: بیستبووم تۆ زۆر لە ڕاکردندا خێرای، ئەی ئەو هەموو چوست و چالاکییەت چی لێهات؟



هێشتا چۆلەکە لەو تانەوتەشەر لێدانە تەواو نەببوو،

واشەیەک دایهاتێ و چۆلەکەی گرت،

کاتێک کەروێشک چارەنووسی چۆلەکەی بینی گوتی:

تۆ کە ساتێک لەمەوبەر پێت وابوو لە هێمنی دای،

و گاڵتەت بە من دەکرد گیرۆدەی هەمان چارەنووسی من بوویت.

نوکتە: هەندێ جار هەتا لە جێی کەسێک

نەبین لە حاڵی تێناگەین.



# ...گێک لە ئاخوڕدا

دوانیوەڕۆی ڕۆژێک، سەگێک لە تەویلەیەکدا پاڵ کەوتبوو. کتوپڕ گاگەلێکی زۆر خۆیان بە ژووردا کرد. کاتێ لە ئاخورەکاندا تفاقیان بینی خۆیان ئامادەکرد تا سکێ برسییان تێر بکەن، بەڵام کتوپڕ سەگ حەپاندی. گاگەلەکە لە کردەوەی سەگەکە سەریان سوورمابوو بەو حاڵەش لە خواردن نەکشانەوە، بەڵام سەگەکە وازی نەدەهێنا و ڕێگەی نەدەدا بچنە پێش. لە کۆتاییدا گاگەل لەو دۆخە ماندوو بوون و لەوێ چونە دەر. یەکێکیان بەوانی دی گوت: "عەجەب سەگێکی خۆ بە زل زانە! نە بۆخۆی دەتوانێ بلەوەڕێ نە ڕێگە دەدات کەس بلەوەڕێ".

نوکتە: ئەو شتەی بۆخۆتان ناتوانن کەڵکی لێ وەرگرن، کەسانی دی لێ بێبەش مەکەن.



# ڕێوی و پشیله





ڕێوی و پشیله قسەیان دەکرد. ڕێوی بە فیزەوە بۆ پشیلەی دەگێڕاوە کە چۆن بە فێڵ و زیرەکی توانیویەتی لە چنگ دوژمنانی قوتار بێت.

دەیگوت: من بۆ قوتار بوون لە دەست دوژمن سەد فێڵ دەزانم.

پشیلە گوتی: من تەنیا یەک فێڵ دەزانم و هەر ئەویشم بەسە.

هەر وا کە ئەو دوانە خەریکی قسە کردن بوون دەنگی چەند تانجییان بیست کە بەرەو ئەوان دەهاتن. پشیلە خێرا چووە سەر دارێک و لە ژێر لق‌وپۆی دارەکە خۆی حەشار دا. ئەوسا گوتی: ئەو فێڵەی من دەیزانم ئەمەیە. ئەتۆ بەتەمای چی بکەیت؟ ڕێوی جوابی نەداوە و هەروا لە فێڵێک دەگەڕا، بەڵام زۆر درەنگ کەوت! تانجییەکان زۆر نزیک‌کەوتبوونەوە، ئەوان ڕێوییە خافڵاوەکەیان گرت و کوشتیان.

نوکتە: ڕێگە چارەیەکی بەکار لە سەد ڕێگە چارەی بەکار نەهاتوو چاکترە.

کورد دەڵێ: هەشت بێ و هەبێ نەک نۆ بێ و نەبێ.

# ڕێوی و قەلەباچکە

ڕێوییەک قەلەباچکەیەکی بینی لە سەر لقە دارێک هەڵنیشتبوو کوتە گۆشتێکی بە دەندووک گرتبوو. ڕێوی بە تەماح بڕیاری دا پیلانێک دانێ بەڵکو کوتە گۆشتەکە بڕفێنێ. دوای کەمێک ڕامان ڕێگە چارەیەکی پەیدا کرد. ڕێوی فێڵ باز چووە پێش و گوتی: ئەی باڵندەی مەزن ئەوەندە بە هەیبەتی کە چاو تێت ڕادەمێنێ چەند جوانی خۆزگە ... خۆزگە دەمتوانی گوێم لە دەنگی خۆش و بلاوێنت بێت.

قەلەباچکە بە بیستنی پەسن و تاریفی ڕێوی لە خۆی دەرچوو. بڕیاری دا دەنگخۆشیی خۆی بسەلمێنێ و دەستی کرد بە قارەقار. بەڵام هەر کە دەندووکی لێک کردەوە کوتە گۆشت کەوتە خوار، ڕێوی خێرا پڕی دایە و هەڵات. ئەو کاتە بوو کە قەلەباچکە تێگەیشت ڕێوی بۆ بەدەستهێنانی کوتەگۆشتەکە فریوی داوە.

نوکتە: کەم کەس هەیە فریوی زمان لووسی نەخوات.

کورد دەڵێ: "پیا هەڵدانی دوژمن بێ فێڵ نییە."




## ژیشک و مارەکان

ژیشکێک لە دارستان، بە شوێن لانەیەکدا ملّوموّی دەکرد. تووشی چەند مار بوو. مارەکان بە ڕووخۆشیەوە داوایان لێکرد بچێتە لانەکەی ئەوان، بەڵام دوای چەند ڕۆژ بەوەیانزانی کە دڕکە تیژەکانی ژیشک، بریندارریان دەکات، بۆیە تکایان لێکرد لانەکەیان جێ بهێڵێ. بەڵام ژیشکی خۆ بە زل زان سنگی لێچەقاندو جوابی نەدانەوە، تەنانەت مارە بەسزمانەکانی لە لانەکەی خۆیان دەرکرد.

نوکتە: کەسی خۆ بە زل زان بە هەموو شت ناقایلە و گوێ ناداتە ناڕاحەتی کەس.

کورد دەڵێ: ئی خۆم بۆخۆم ئی تۆش دەخۆم.

# کەڵەکێویەک لە گەوڕدا



کەڵەکێویەک کە تانجی و توڵە دوای کەوتبوون، پەنای بردە بەر گەوڕی گاگەل و خۆی لە ژێر باقەگیاکاندا حەشاردا، تەنیا جێگەیەکی لەشی کە دەبیندرا نووکی شاخەکانی بوون. کەمێ دواتر ڕاوچیەکان گەیشتن و لە خزمەتکارەکانیان پرسی: "کەڵەکێویتان بینیوە یان نا؟" خزمەتکارەکان گوتیان "هیچمان نەدیوە" و ڕاوچیەکان ڕۆیشتن. زۆری نەخایاند خاوەنی گەوڕەکە گەیشت و سەیرێکی ئەملاولای کرد. شتێکی نامۆ لە گەوڕەکە سەرنجی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، دواتر پەنجەی بۆ لای باقەگیاکان ڕاداشت و پرسی: "ئەو دوو شتە سەیرە چین کە لە ناو باقەکان هاتوونەدەر؟" دوای ئەوەی خزمەتکارەکان باقەگیایان لادا،

کەڵەکێویەکەیان دۆزیەوە و کوشتیان.

نوکتە: هیچ شتێک لە چاوی خاوەن ماڵ ون نابێ.




# پەڕەسێلکە و باڵندەکانی دیکە

مەزرێرێک، لە مەزراکەیدا تووە کەنەفی دەچاند. کەمێ دواتر پەڕەسێلکەیەک وێڕای پۆلێک باڵندەی دیکە، بۆ دانەخواردن لە مەزراکەدا نیشتنەوە، پەڕەسێلکە گوتی: ئاگاداری ئەو پیاوە بن.

باڵندەکانی دیکە پرسیان بۆچی؟

- ئەو خەریکە تووی کەنەف دەچێنێ، وریا بن و هەموو تووەکە بخۆن، دەنا دواتر پەژیوان دەبنەوە. بەڵام باڵندەکان، گوێیان بە قسەی پەڕەسێلکە نەدا.

کەنەفەکان گەشەیان کرد و ماوەیەک دواتر وەرزێر دروێنەی کردن. سەرەتا کەنەفەکانی کردە دەزوولە و ئەوسا لە دەزوولەکان، تۆڕێکی لەباری دروست کرد بۆ ڕاوی باڵندە. ڕۆژێک باڵندەکان هاتبوونە مەزرا دان بخۆن، بەڵام کاتێک بە خۆیان زانی، کەوتنە ناو تۆڕەکەوە. لەو ساتەدا ئامۆژگاری پەڕەسێلکەیان بە بیر هاتەوە بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو. پەڕەسێلکە لە سەر لقێک هەڵنیشتبوو گوتی: "پێشتر پێم گوتبوون ئاگادار بن، خۆزگە بە گوێتان کردبام"!

نوکتە: دەبێ تووی شەڕ و خراپە لە ناو بەرین، دەنا گەشە دەکات و دەبێتە هۆکاری لە ناو چوونی خۆمان.



# خۆر و با

ڕۆژێک خۆر و با، دەمەقاڵەیان بوو. ئەوان دەیانهەویست بزانن کامیان بەهێزترە. هەروا کە خەریکی دەمە بە دەمە بوون، ڕێبوارێکیان بینی بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشت. خۆر گوتی: "ڕێگاچارەیەکم دۆزیوەتەوە کە کۆتایی بەم دەمەقاڵە دەهێنێت. کەسێک بە هێزترە کە بتوانێت باڵتەی ئەو ڕێبوارە لە بەری دابکەنێت." با گوتی من سەرەتا دەست پێ دەکەم. هەر بۆیە خۆر لە پشت هەورێکەوە پەنای گرت و با بە هەموو هێزیەوە هەڵیکرد، بەڵام هەتا زیاتر هێزی وەبەر خۆی دەنا، ڕێبوار باڵتەکەی توندتر لە خۆی دەپێچا. ئاخری با بە ناهومێدییەوە خۆی بە دەستەوە دا. ئەوجار خۆر لە پەنای هەور هاتە دەر و بە گڕوتینەوە گەرمای باراند، زۆری پێنەچوو ڕێبوار لە بەر تینی گەرما باڵتاوەکەی داکەند.





نوکتە: میهرەبانی لە توند و تیژی کاراترە.

کورد دەڵێ: "مار بە قسەی خۆش لە کون دێتە دەر."

# کەروێشک و مشکەکان



کەروێشکێکی لەڕ بە کونە مشکێکدا چوە ناو عەمباری دەغڵ‌ودانی جووتیارێک. کاتێک کەروێشک بینی عەمبار پڕە لە گەنمەشامی، زۆر کەیف‌خۆش بوو، هەر لە نزیک عەمبارەکەوە کولانەیەکی بۆخۆی سازکرد هەتا بێ‌ماندووبوون گەنمە شامی بخوات. زۆری نەخایاند کەروێشک قەڵەو بوو.

دوای ماوەیەک، کەروێشک بیستی جووتیار دەیهەوێت گەنمە شامیەکانی بفرۆشێت. خەم دایگرت و بڕیاری دا بڕێک گەنمە شامی بۆ خۆی هەڵگرێ. کەروێشک بەرەو کونەمشکەکە چوو ویستی بچێتە عەمبارەکەوە، بەڵام هێندە قەڵەو ببوو کە بە کونەکەدا نەدەچوو. مشکەکان کە بینیان کەروێشک لە کونەکەوە ناچێت بە دەنگی بەرز پێکەنین، یەکێکیان گوتی: "کەروێشک! تۆ بەو گەنمەشامیەی کە هی خۆت نەبوو، زۆر بە جوانی خزمەتی خۆتت کردووە و هێندە قەڵەو بووی کە ناتوانی بە هەوڵی خۆت ورگی خۆت تێر بکەیت. بڕۆ بە خۆماندووکردن، خواردن پەیدا بکە ئەوسا لەڕ دەبیتەوە و دووبارە دەتوانی بچیتەوە ناو عەمبارەکە و گەنمە شامی بەلاش بخۆی."



نوکتە: ئەوانەی ژیانی خۆیان تەنیا بە خۆشی و ڕابواردن بەسەر دەبەن لەوانەیە ناچار ببن لەتەک گیروگرفتی زۆردا ڕوو بە ڕوو ببنەوە.

کورد دەڵێ: دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە.

# مشکی شارستانی و مشکی دێهاتی




ڕۆژێک مشکی شارستانی بۆ سەردانی ئامۆزاکەی چوو بۆ دێ. مشکی دێهاتی بە نان و پەنیر و کەرەو لوبیا، میوانداری لێ‌کرد. مشکی شارستانی بە لالووتەوە سەیرێکی خواردنەکانی کرد و گوتی: "ئامۆزا بە هیچ جۆرێک تێناگەم چۆن دەتوانی بەم خواردنە ساکارانەوە هەڵبکەی! ئەگەر لەتەک مندا بێی بۆ شار بە دڵنیاییەوە جارێکی‌تر بۆ دێ ناگەڕێیتەوە." ڕۆژی دواتر هەر دوو مشکەکان بەرەو شار بەڕێ‌کەوتن و شەو درەنگان گەیشتنە نشینگەی مشکی شارستانی. مشکی شارستانی ئامۆزاکەی بردە ژوورێکی گەورەی نان خواردن، بڕێکی زۆر خواردنی خۆش لە سەر مێزی نان خواردن بەجێ مابوو. مشکەکان دەستیان بە خواردنی ژێلە و کەیک کرد. کتوپڕ دەنگی مرە و حەپەی سەگیان هاتە گوێ. مشکی دێهاتی پرسی "ئەوە دەنگی چیە؟"

مشکی شارستانی وەڵامی داوە "هیچ نیە دەنگی سەگەکانی خاوەنماڵە".

ڕێک لەو ساتەدا دەرگا کراوە و دوو قەپەگۆڵی گەورە هاتنە ژوور. مشکەکان لەسەر مێزەکە بازیان دا و هەڵاتن. مشکی دێهاتی گوتی: "ماڵ ئاوا ئامۆزا".

مشکی شارستانی گوتی: "ها! هەروا زوو دەڕۆی؟"

مشکی دێهاتی گوتی: "بەڵێ!" ئەوسا ڕاستە و ڕاست بەرەو دێ بەڕێ کەوت.

نوکتە: پارووە نانێک بە ئاسوودەیی چاکترە لە خواردنێکی تێر و تەسەلی پڕ لە ترس و دڵە ڕاوکێ.




# ڕێوی و گورگ

گورگێک کە چیتر توانای ڕاوی نەمابوو بە پەنهانی دەستی کرد بە پاشەکەوت‌کردنی خۆراک لە لانەکەیدا. ڕۆژێک ڕێوییەک هاتە لای و پرسی "هاوڕێی خۆشەویست! بۆچی زۆر لە دەرەوە ناتبینم؟" گورگ گوتی: "نەخۆشیەکی تایبەتیم گرتووە، ناچارم دەکات لە ماڵەوە دانیشم. نزام بۆ بکە زوو چاک ببمەوە".

ڕێوی ڕۆیشت و پیلانێکی دانا تا پاشەکەوتی خۆراکی گورگ وەچنگ بخات. هەر بۆیە چوە لای شوانێک و داوای لێکرد گورگ بکوژێت. شوانە داواکەی پەسند کرد و گورگی کوشت. ڕێوی خێرا چوە لانەی گورگ و خۆراکە پاشەکەوتەکەی گورگی داگیر کرد. بەڵام خۆشحاڵی ڕێوی زۆری نەخایاند چونکە کەمێ پاشتر شوانە ڕێویشی کوشت.

نوکتە: زۆربەی ئەوانەی بەبێ‌بیرکردنەوە کار دەکەن تووشی چەرمەسەری چاوەڕوان نەکراو دەبن.

کورد دەڵێ: چاڵ بۆ خەڵکی هەڵکەنی بۆخۆتی تێ دەکەوی.

# تانجی و کەڵەشێر و ڕێوی

تانجی و کەڵەشێر کە وێکڕا دەچوون بۆ سەفەر گەیشتنە دارستانێکی چڕ. ئەوان بڕیاریان دا شەو لە پەنا دارێکدا بەسەر بەرن. هەر بۆیە کەڵەشێر پەڕیە سەر لقێکی دارەکە و تانجی لە بن دارەکە دا پاڵ کەوت. بەرە بەیان کەڵەشێر بە سروشتی خۆی بانگێکی بەرزی دا. ڕێویەک کە لەو دەورو بەرە بوو دەنگی کەڵەشێری بیست و بڕیاری دا کەڵەشێر بۆ خواردنی قاوەڵتی ڕاو بکات. هاتە بن دارەکە و بە کەڵەشێری گوت: کەڵەشێری خۆشەویست! ئەگەر ڕێگەم پێ بدەیت پێم خۆشە ئەمڕۆ لە خزمەت تۆدا بەرمە سەر.

کەڵەشێر گوتی: تکایە دەرگاوانەکەم لە بن دارەکە دا لە خەو هەستێنە تا ڕێگەی هاتنە ژوورەوەت پێ نیشان بدات . ڕێوی لە تانجی نزیک کەوتەوە بەڵام بەر لەوەی فریای قسە کردن بکەوێت تانجی پەلاماری داو لەت و پەتی کرد.

نوکتە: ئەوەی داو بۆ کەسانی تر دادەنێت خۆی لە داوەکە دەکەوێت.






# مشکەکان و ڕسقەکان

مشکەکان و ڕسقەکان بەردەوام لە شەڕدا بوون. لە هەموو شەڕێکدا مشکەکان دەشکان. ئەوان ڕۆژێک کۆ بوونەوەیەکیان ڕێکخست تا لەم بارەوە ڕاوێژ بکەن. مشکەکان بەو ئەنجامە گەیشن کە هۆکاری سەرەکی شکستەکانیان ئەوەیە کە هیچکام لە پەلەکانیان سەرپەلی نیە؛ ئەوسا چەند مشکیان هەڵبژارد تا لە شەڕدا ڕێبەرایەتی مشکەکان بکەن.

لە شەڕی دواتردا، سەرپەلەکان کە تازە هەڵبژێردرابوون، شاخی گایان لە سەری خۆیان بەست تا دوژمنەکانیان بترسێنن بەڵام بە داخەوە بێ کەڵک بوو. مشکەکان سەر لە نوێ شکستیان هێنا، سەرپەلەکان سەرەڕای ئەو شاخانەیش، نەیاندەتوانی سەرکەوتوو بن بگرە هەر ئەو شاخانە بوونە هۆکاری ئەوەی ڕسقەکان زووتر بیانگرن و بیانکوژن.

نوکتە: ئەوانەی زیاتر لە بەر چاون چەرمە سەریان زیاترە.

# مەیموون و وشتر



ڕۆژێک گیانلەبەرانی دارستان جێژنێکی مەزنیان ڕێکخست. مەیموون بە جووڵە سەیرەکانی سەرنجی گیانلەبەرانی ڕاکێشا و هەموو گیانلەبەرەکان ئافەرینیان کرد. وشترێک کە بەشداری ئەو جێژنەی کردبوو، ئیرەیی بە مەیموون برد. کە نۆبەی وشتر هات لاسایی مەیموونی کردەوە بەڵام جووڵەکانی وشتر ئەوەندە نالەبار و گاڵتەجارانە بوو کە هەموو گیانلەبەرەکان تووڕە بوون، ئەوان بە دار داهاتنە وشتر و لە جێژنەکە دەریان کرد.

نوکتە: لاسایی کردنەوەی کەسانی تر کارێکی گەمژانەیە.




# دوو قرپۆک

سەردەمانێک دوو قرپۆک، لە پەنا گوندێک دەژیان. ئەوان زۆر هاورێ بوون، یەکێکیان لە گۆمێکی قووڵ، دوور لە چاوی خەڵک دەژیا و ئەوی‌تریان لە گۆلاوێکی قەراخی رێگا. قرپۆکی دانیشتووی گۆم، هاورێکەی ئامۆژگاری دەکرد کە ماڵەکەی بگوێزێتەوە و بچێتە گۆم و لەوێ بژی، تەنانەت گوتی لە گۆمەکە خواردنی زۆر هەیە و هیچ مەترسیەکیشی لێ‌نیە بەڵام هاورێکەی بە قسەی نەکرد و گوتی "بەم ژیانە سەختەی خۆم راهاتووم." چەند رۆژ لەوە دوا گارییەکی گەورە کە بەرێگادا دەرۆیشت کەوتە گۆلاوەکە و قرپۆکی پان کردەوە.

نوکتە: کەسێ کە بە قسەی هاورێ باشەکانی ناکات، زیان بە خۆی دەگەیەنێت.




# قرژاڵ و ڕێوی

قرژاڵێک لە قەراخ ئاوێک دەژیا. پاش ماوەیەک ئەوێی بەجێ هێشت و لەوەڕگایەکی بۆ ماڵی تازەی هەڵبژارد. ڕۆژێک ڕێوییەکی برسی قرژاڵی بینی و گرتی. لەو کاتەدا کە ڕێوی دەیهەویست بیخوات قرژاڵ هاواری کرد: "ئەم چارەنووسە شیاوی منە. من کە جێگام کەناراوە، چیم لەم لەوەڕگایە داوە؟"

نوکتە: ئەگەر بە چارەنووسمان ڕازی بین خۆشبەختین.

# گورگەکان و مەڕەکان



سەردەمانێک سەگ، مەڕیان لە گورگ دەپاراست. هەر بۆیە گورگ زۆر بە ئاستەم دەیتوانی مەڕ ڕاو بکات. ڕۆژێک چەند گورگ، بە ڕانە مەڕێکیان گوت: باشە بۆچی ئێمە هەموو کات بە شەڕ بێین؟ هەرکات لێتان نزیک دەبینەوە، ئەو سەگە شۆفارانە دێنە بەینمانەوە، تەنانەت ئەو کاتەی کە بڕیاری ئازاردانی ئێوەشمان نیە لێمان دەحەپێنن. ئەگەر ئەو سەگانە لە خۆتان دوور بخەنەوە ئەوا ئاشتی لە نێوانمان بەرقەرار دەبێت.

مەڕەکان، کە بوونەوەر گەلێکی نەزان بوون، بە سانایی فریویان خوارد و سەگەکانیان لە خۆیان دوور خستەوە. هەر کە سەگەکان دوور کەوتنەوە، گورگەکان بەربوونە مەڕەکان و زۆری نەخایاند هەمویان خواردن.



نوکتە: هەرگیز هاوڕێکانتان بە خاتری دوژمنەکانتان وەلا مەنێن.

# داربەڕوو و قامیشەکان

دارێکی بەڕووی گەورە لە کاتی تۆفاندا لە ڕیشە دەرهات و لە قەراخ چەمێکدا کەوتە ناو قامیشەڵانێک. کاتێک داربەڕوو سەیری کرد تۆفان قامیشەکانی هەڵنەکەندوە پێی گوتن: پێم سەیرە کە چۆن ئەو با و بۆرانە بەهێزە نەیتوانیوە هیچ ئازارێک بە ئێوەی لاواز و سووک بگەیەنێت؟ قامیشەکان گوتیان: داربەڕوو! تۆ هەرکاتێک تۆفان دێت، هەوڵ دەدەیت لە بەرانبەریدا قورس و قایم بوەستی و ململانێی بکەی. بە داخەوە ئەمڕۆ با سەرکەوت! بەڵام ئێمە بە پێچەوانەی تۆ، تەنانەت لە بەرانبەر شنەباشدا دەچەمێینەوە و سەلامەت دەبین.

نوکتە: خۆ بە زل مەزانە، سەرکەوتوو دەبی.

# مشکەکان و قرپۆکەکان

سەردەمانێک لە ناوچەیەکی زەلکاودا لە نێوان قرپۆکەکان و مشکەکاندا، شەڕێکی خوێناوی قەوما. کاتێک شەڕ گەیشتە ترۆپک، واشەیەک لە ئاسمانەوە داهاتەوە. واشە چەند مشک و قرپۆکی بە چنگ گرت وهەڵفڕی. واشە دووبارە و دووبارە ئەم کارەی کردەوە و ئەوەندەی مشک و قرپۆک گرت تا کۆتایی بە شەڕەکە هێنا.

نوکتە: کاتێک گێلەکان بەشەڕ دێن عاقڵەکان کەڵک وەردەگرن.



# هەڵۆ و کەڵەشێرە شەڕانییەکان

دوو کەڵەشێری شەڕانی بۆ سەرۆکایەتی‌کردنی حەوشەی تەویلەیەک بەشەڕ هاتن کاتێک شەڕ دوایی هات کەڵەشێرە بەزیوەکە، خۆی لە گۆشەیەکدا شاردەوە. لە بەرانبەردا کەڵەشێرە براوەکە، پەڕییە سەر دارێکی بەرز و باڵی پێکدا دان و ملی بۆ خوێندن هەڵبڕی. ڕێک لەو کاتەدا، هەڵۆیەک لە ئاسمانەوە دایهاتێ و بە چنگەکانی گرتی و بردی. کەڵەشێرە بەزیوەکە، کاتێک ئەوەی بینی، لە شوێنی خۆی هاتە دەر و لەوە بەدوا بوو بە سەرۆک و خاوەنی بێ ڕکابەری حەوشەی تەویلەکە.

نوکتە: لووت بەرزی سەرەتای شکستە.

# فەرهەنگۆک




**ئاتاجی:** پێداویستی، پێویستی، زەخیرە.

[illegible]، جێ لەوەڕی ئاژەڵ.

[illegible] جوامێری، بوێری.

**ئاژەڵ:** [illegible]ڵات، وڵسات، گیانەوەر.

**ئاسنگەر:** ئاسنکار، وەستا خەلە.

**ئاسنین:** ئاسنی، لە ئاسن.

**ئاکار:** خوو، ڕەوشت.

**ئاماژە:** هێما، نیشارە.

**ئاواتەخواز:** هیوادار، بەتەما.

**ئاوکێشان:** ئاوهەڵگرتن، قورس بوون بەهۆی تەڕبوونەوە.

**ئاوەنگ:** شەونم، تەڕایی سەر گەڵای گیا.

**ئەنگاوتن:** پێکان، لێدان بە تیر.

**ئێرەیی:** بەغیلی، حەسوودی.

**بازاری کۆیلە فرۆشان:** جێی کڕین و فرۆشتنی مرۆڤی کۆیلە لە ڕۆژگاری کۆندا.

**باقە:** بەستە، باغەی بەستراوی ئالف.

**برە:** شفرە، مەرموول، کەڵپی نێرە بەراز.

**بڕیاردان:** عەهد کردن، شەرت کردن.

**بزەڵە:** کودەڵەی بەراز، بەچکەی بەراز.

**بلیمەت:** زۆرزان، زانا، ژیر.

**بۆڵەبۆڵ:** پرتە و بۆڵەی زۆر

**بوونەوەر:** جانەوەر، گیاندار.

**بەدەمار:** بەفیز، خۆ بەزلزان

**بەدەمەوە** هاتن: بەهاناوە چوون.

**بەردووچکە:** خیز، زیخ، بەردی گچکە.

**بەردەنگ:** بیسەر، گوێگر.

**بەڕە:** گلیم، ژێرڕاخەرێکە.

**بەرەبەیان:** شەوەکی، سبەینێ زوو

**بەرهەڵدان:** ئازاد، ڕەها.

**بەقەدەر:** بەقەد، بەرانبەر.

**بەور:** بەبر، درندەیەکی گەورەی گۆشتخۆرە.

**بێباک:** بێترس، نەترس.

**بێبەزەیی:** بێڕام، بێڕوحم.

**بێشە:** کون، لان، لانە.

**بێشەلان:** بێشە، مێشە، چخور، لێرەواری چڕ.

**پاروو:** تیکەی ئامادە بۆ خواردن.

**پاشوو:** پاش، لای دواوەی ئاژەڵ.

**پرپێداکردن:** فڕاندن، ڕفاندن بلەز.

**پرینچک:** پریشکە، پریشک.

**پشکۆ:** سکڵ، پەنگر، پەرەنگ.

**پەرژین:** پەرچین، پەرژان، شورەی بە دروو.

**پەرەسێلکە:** تەیر، حاجی ڕەشک، پلیسرک.

**پەری:** فریشتە.

**پەژیوان:** پەشیمان.

**پەل:** دەستە، پۆل، کۆمەڵێ زیندەوەر.

**پەلەقاژە:** لاقەفرتە، تەقلا بۆ دەرباز بوون.

**پەیڤ:** قسە، ئاخاوتە.

**پیاسە:** گەشت، گەڕان.

**پیاوەتی:** مەردایەتی، گەورەیی.

**پێشبڕکێ:** بەریکانێ، ملە، ملبەملێ.

**پێشنیار:** پێشنیاز.

**پێشهات:** ڕوداوو، دەرهات.

**پیلان:** کەین و بەین بۆ فێڵ بازی، نەخشەی کار.

**پیلەگرتن:** شەڵتاخ پێگرتن، گەڕ و تەشقەلە.

**پێهەڵپەڕین:** لێکەوتن.

**تاقگە:** تاڤ، قەڵبەزە، ئاوهەلدێر.

**تاودان:** لین دان، غاردان

**ترۆپک:** نەوپەڕ، ئاخرین ڕادە، لوتکەی بەرزایی

**تۆڵە:** تۆڵ، قەرەبوو، پاداشت.

**تۆڵە سەندنەوە:** قەرەبوو کردنەوە لە دوژمن.

**تەڵە:** ئامرازی ڕاو.

**تەما:** هیوا، هێڤی.

ەمر، عومر.

**تێپەڕان:** چوون، ڕۆیشتن.

**تێ تەقاندن:** هەڵاتن.

**تێڕامان:** بیر لێ کردنەوە.

**تیر هاوێژ:** تیرهانداز، پێکەرە، نیشانە پێک.

**تینوو:** تونی، تینگ، قورگ وشک.

**جریواندن:** خوێندنی سیسرک.

**جۆراو جۆر:** سەیر و سەمەرە.

**جووتیار:** جۆتکار، وەرزێر، کەشاوەرز

**جوونەوە:** جاوینەوە، قرتاندن بەددان

**چڕ:** لێرەواری پڕ دار و درەخت.

**چرپە:** سرتە، خشە، کەمترین دەنگ.

**حەپە:** دەنگی سەگ.

**حەسرەت:** ئاخ، داخ.

**چرنووک:** چنگ، پەنجەی مەل.

**چنگوڕ:** چنگ، پەنجە.

**حەپاندن:** حەپە کردن، وەڕین(سەگ).

**حەقدەست:** کرێ، مز، حەق.

**حەوادان:** وەحەواخستن، بەرز کردنەوە.

**خاو و خلیچک:** خاو و خلیسک، شل و شەویق، نەبەگە.

**خاوەن ماڵ:** ساحەب ماڵ، خودان ماڵ، ماڵ خێو.

**خشپە:** خشە، دەنگی خشە خشە.

**خۆ بە زل زان:** بە دەمار، خۆ پەسنکەر.

**خۆ خافڵاندن:** خۆ سەرقاڵ کردن.

**خەرتەل:** خەر داڵ، داڵ، داڵاش.

**خەڵەتاندن:** فریودان، خاپاندن.

**خەماوی:** دەردەدار، خەم هێنەر.

**خەیاڵ پڵاو:** خەیاڵی دوور و دەس نەکەوتوو.

**خێو:** دێو، خوول، غوول.

**دابەش کردن:** بەخشینەوە، دالبەش کردن.

**دارستان:** دارسان، جەنگەڵ.

**داهاتن:** تێ ڕۆهاتن.

**دراوسێ:** ١.جیران، هاوسێ. ٢. دەوروبەر.

**دۆڕان:** دانان، بەزین.

**دۆڕاندن:** دانان لە قوماردا.

**دوو فاق:** دولکە، دو حاچە، سمی داقڵشاو.

**دەبەنگ:** ١. بێ ئاوەز، گێل. ٢. بێ غیرەت.

**دەرباز:** خلاس، ڕزگار.

**دەرەنجام:** ئاکام، ئەنجام.

**دەزوولە:** داریکەی وەک هەودا بۆ ڕاوەمەل.

**دەسکەوت:** داهات، دەسکەفت.

**دەمەقاڵە:** دەمقرە، قوونەشەڕ، شەڕە دەندووکە.

**دەوەن:** دەون، دەڤی، پنجە داری لێرەوار.

**ڕاست و ڕەوان:** ڕاست، ڕاستەقانی.

**ڕان:** مێگەل، کەر تەمەر.

**ڕاوچی:** نێچیروان، ڕاڤەڤان.

**ڕاوێچکە:** ملوەو، گەران بۆنیازێک.

**ڕاوێژ:** تەگبیر و ڕا، مەشوەرەت.

**ڕایە کەوتن:** حەق بوون، لێ وەشانەوە.

**ڕۆچوون:** تێ چەقین، چەقان.

**ڕووداو:** ڕوودان، بەسەرهات.

**ڕەبەن:** ڕەبەنۆک، سەڵت و قوڵت.

**ڕەخت:** زەنبەری سەری ئەسپ.

**ڕەقە:** ڕەق، ڕەقیاو، کیسەڵی ئاوی.

**ڕەوە:** ١. ڕەوگ، ڕەوەی وڵاخ ٢. ڕان، مێگەل.

**ڕێچکە:** ڕێ، ڕێچک، ڕچە، کوێرە ڕێ.

**ڕێ لێ تەنین:** ڕێ لێ گرتن، ڕێ پێ نەدان.

**زگماک:** سکماک، خۆرسک، دیاردەیەک هەر لە منالییەوە لە گەڵ کەسێک بێ.

**زۆر و زەوەندە:** زۆر، فرە.




... ۆربەی.

... دەنگی کەر.

**زەڕین:** دەنگی کەر.

**زەنگۆڵە:** زەنگ، زەنگولی گچکە.

**زێڕی پوختە:** زێڕی پاک و تەکوز خالیس.

**زین:** مارەکە، جێی دانیشتنی سوار لە سەر پشتی ئەسپ لە چەرم.

**زیندەوار:** جانەوەر، گیاندار.

**ژیاننامە:** نامە و بەسەرهاتی ژیانی کەسێک.

**ژیر:** وریا، زرنگ، زیرەک.

**سارد و سووک:** ئاوی خۆش و گەوارا.

**ساکار:** سادە، ئاسایی.

**ستەمکار:** زۆردار، زاڵم.

**سڕ:** تەزیو، سەرما بردوو، کەسیرە.

**سم:** سوم، سمووچک، پاقولاخ، سمی ئاژەڵ.

**سنگ لێ چەقاندن:** خۆ داسەپاندن، مانەوە بە زۆرەملی.

**سنگی دارین:** سنگی لەدار تاشراو.

**سووکەڵە:** گچکەی سووک.

**سەدەف:** گیاندرێکی ناو ئاوە.

**سەر بەستی:** ١. سەربەخۆیی، ئازادی. ٢. بێ قرە، بێ کێشە.

**سەرپەل:** فەرماندە، سەرۆکی پەل.

**سەر چۆپی:** ١. ڕەمکێشی هەڵپەڕکێ. ٢. بریتی لە دەسەڵاتی کارێک.

**سەرخەو:** سوکە خەو، خەو نووچکە.

**سەر خەو شکاندن:** چۆرت لێدان.

**سەردەم:** ڕۆژگار، دەور، زەمان، عەسر.

**سەر سم دان:** هەڵەنگوتن، ڕەتەڵە برن.

**سەر کۆنە:** لۆمە، تانە، سەرزەنشت.

**سەر لە نوێ:** ژنو، لە نوێ، لە سەر ڕا.

**سەرمەشق:** ڕێنوێن، ڕێ نیشان دەر.

**سەرنج ڕاکێش:** جێی سەرنج و تێ ڕامان.

**سەرو گوێلاک:** دەم و چاو، سەر و سەکوت.

**سەرە ڕا:** سەر ڕا، دەگەڵ ئەوەشا.

**سەرە مەرگ:** ئاویلکە، گیانەڵڵا

**سەرە و ژوور:** سەر بەرەو ژوور.

**سەقەت:** مرداره وبووی یەکسم.

**سەقەت بوون:** تۆپین، تیاچوونی یەکسم.

**سەلمێنراو:** سەلمێندراو، چەسپاو.

**سیرمە کۆن:** پێستەی بۆگەن.

**سیسرۆکە:** سیسرک، سیسرە، جانەوەرێکە لە تیرەی کوللە.

**سینی:** دەفری پەل.

**شلپە:** دەنگی کەوتنی شت لە ئاو.

**شۆرباو:** شۆربا، چێشتی شل و تراو.

**شوکرانەبژێر:** سوپاس گوزار.

**شەپۆل:** مۆنج، پێل.

**شەڕەنگێز:** شەڕخواز، شەڕانی.

**شەکەت:** ماندی، ماندوو، هیلاک.

**عەمبار:** هەمار، ئەنباری دەغڵ.

**فوودان:** پفدانک، میزەڵانی، فدبال.

**فەردە:** تا، گۆنی، تەلیسی زل.

**فێڵباز:** گزیکار، مەکراوی.

**قاڵاو:** قەل، قاژوو.

**قریۆق:** بۆق، قورواق.

**قۆچ:** شاخ، ڕەقایی سەری ئاژەڵ.

**قوڕگ:** گەروو، سورینچک.

**قورینگ:** قورنگ، دورنا، مەلێکە.

**قوم:** بر، کەم، کێم.

**قومێ ئاو:** برێک ئاو.

**قومارباز:** قومار کەر، قومارچی.

**قەبارە:** بارست، حەجم.

**قەلەباچکە:** قەرەباچکە، قشقەرە.

**[illegible]** قوڕە، جلەشینەی سەر ئاو.

**قەومان:** ڕوودان، قۆمان.

**قێزەون:** ناشیرین، ناپیاوانە.

**کابە:** گەنمەشامی، گەرمە شانی.

**کادێن:** کایێن، عەماری کا.

**کارمامز:** بەچکە ئاسک.

**کارەسات:** ڕووداوی دڵتەزێن.

**کاژێر:** کات ژمێر، دەم ژمێر، سەعات.

**کاوە خۆ:** لە سەرە خۆ، هێور.

**کتوپڕ:** لە ناکاو، لە پڕا.

**کلۆر:** ١.بۆشایی، بەتاڵایی. ٢. ناو بەتاڵ.

**کوت:** جنک، پل، لەتە گۆشت.

**کۆتەدار:** کۆلک، کۆتەرە دار.

**کوتە گۆشت:** لەتە گوشت، پلە گۆشت.

**کورت خایەن:** کات کورت، کەم تەمەن.

**کۆز:** ١. ژووری تایبەتی بەرخ و کار. ٢. پەچە، حەوشەی ئاژەڵ لە ئانۆک.

**کۆکە کۆک:** قلخە قلّخی زۆر.

**کولانە:** ١. هێلانە، قسن، کولێنیتی مریشک. ٢. لان، لانەی لاوری کۆڤی.

**کۆڵەوار:**١. زۆر حاڵخراپ. ٢. بێدەست، کار لێ نەهاتک.

**کوزوو:** گلێنەی مل باریک بۆ هەنگوین.

**کوزەی مل باریک:** جەرە، جۆری گلێنەی مل تەنکە.

**کۆیلە:** بەنی، بەندی، زەرخری.

**کۆیلە فرۆش:** کەسێ کۆیلە دەفرۆشێ.

**کەشکۆڵ:** قاپێلکی میوەیە کە دەروێشان دەسکرەی زنجیری تێدەخەن و سواڵی پێوە دەکەن.

**کەڵەباب:** کەڵەشێر، دیکل، دیقل.

**کەڵە کێوی:** جۆری حەیوانی کێوی.

**کەلەلا:** شەل و پەت، شپرێو.

**کەناراو:** کوێ چۆم، لێواری چەم، بەستێن.

**کەند:** ١.تەپ، تەپۆلک.٢. شانی چیا ٣. قوولکە٤. ناوبڕ

**کەندوو:** کوار، خەڵێفەمێش، پلوورە هەنگ.

**کەنەف:** وش، گیاکندر، بەرگواڵە، گیایەکە.

**کەوڵ:** کەڤل، پێستەی مەڕو بزن و هەر حەیوانێ.

**کەین و بەین:** ڕووداو، کاری قەوماو.

**کیسەڵ:** کیسۆ، کسل، کێسو.

**کێش:** گرانی، قورسایی، وەزن.

**کێش و قەبارە:** قورسی و بارست

**گاجووت:** گانێری تایبەتی بۆ جووت کردن.

**گاگەل:** گایەل، کۆمەڵێ ڕەشە وڵاغ.

**گاڵتەجاڕ:** جێی پەندی خەڵکی، مەسخەرە

**گامێش:** گامووش، مێوینەی کەڵ.

**گۆلاو:** گۆل، ئەستێر، ئەستێل

**گۆمیلکە:** گۆل، گۆمی کچکە.

**گوێ:** ١. گۆش، گوێچکە ٢. کەنار،لا، نزیک

**گوێدرێژ:** کەر، هەر.

**گەڕ:** گێچەڵ، تەشقەڵە.

**گەل:** ١. کۆ، کۆمەڵ ٢. کۆمەڵی مرۆ.

**گەوڕ:** تەویلە، ژووری ئاژەڵ.

**گەوهەر:** گەوەر، بەردێکی بە نرخە

**گیان دان:** گیانەڵا، دەمی ئاویلکە.

**گیان لەبەر:** جانەوەر، زیندەوار.

**لاسایی:** لاسا، چاولێکەری.

**لەت و پەت:** پارچە پارچە، لەت و کوت.

**لەڕ:** لاواز، کز، داڵگۆشت.

**لەق لەق:** لەک لەک، حاجی لەق لەق، مەلێکە.

**لەقە:** جووتە، لووشکە.

**لەمەڕ:** سەبارەت، لە هەمبەر.

**لە مێژینە:** کۆن، قەدیمی.

**لەوەڕگا:** جێ لەوەڕ، لەوەڕگە.

**لێ خۆش بوون:** بەخشین.

**مالۆس:** بەرازی مێ.

**مشکە کوێرە:** مشکە کۆرە، جۆرێ‌مشکە.

**ململانێ:** ململانە، ڕکەبەری.

**منداڵۆچکە:** منداڵی گچکە.

**مەترسی:** ١. سام ٢. جێگەی ترس.

**مەترسیدار:** بڤە، جێی مەترسی.

**مەزرا:** مووچە، کێڵگە.

**مەلەوان:** مەلەزان.

**مێژوو نووس:** تاریخ نووس.

**مێگەل:** ڕان، گەلە، کەرک، دەستەمەڕ.

**مێو:** داری ترێ.

**نابەجێ:** نەشیاو، نەلە جێ.

**ناخ:** دڵ، دەروون، هوندر.

**نارۆکە:** سۆزەی لە بەر خۆرە، قامێکە.

**ناکاو:** نەکاو، کوتوپڕ.

**ناوئاخن:** ناواخن، نێوەرۆک.

**ناهومێد:** هیوا شکاو، هێڤی بڕاو.

**نزا:** دۆعای چاک، پاڕانەوە بەنیازی باش.

**نشینگە:** جێی دانیشتن و مانەوە ، نیشتمان.

**نۆبەن:** نۆبەند، جوانەگای سێ ساڵە کە تازە دەخرێتە بەر نێر.

**نیمچە سووتاو:** نیوە سووتاو، نیمە سۆزیاگ.

**واشە:** مەلێکی ڕاوکەرە.

**ورووژان:** ئاڵۆزانی مێش و زەردەواڵە.

**وشترمل:** وشترمر، جانەوەرێکە وەک مامر دەچێ و بڵندە و نافڕێ.

**وەدیتن:** دۆزینەوە.

**وەرزێر:** جووتیار، جۆتکار.

**وەرس:** نەڕەز، عێدز، جاڕز، عاجز، قەڵس.

**وەزاڵە هاتن:** وەڕز بوون، جاڕز بوون.

**وێژە:** ١.زک، گیان. ٢. پەلاماری پەنامەکی بۆ بردن.

**وێکرا:** بەهڤرا، دەگەل هەڤ، پێکەوە.

**وێنە:** عەکس، ئەسک.

**هاو ڕەگەز:** هاو خوێن، هەم نژاد.

**هاوڕێ:** هەڤاڵ، دۆس، ڕەفیق.

**هرووژم:** پەلامار، شاتاوڵ، هێرش.

**هۆکار:** سەبەب، بایس.

**هەرا:** ١.شەڕە قسە، دەمقرە ٢. دەنگۆ، قاو

**هەرزەکار:**گەنج، لاو، جحێڵ.

**هەرێم:** ناوچە، مەڵبەند.

**هەڵبەزو دابەز:** هەڵبەزینی زۆر.

**هەڵپاچین:** بڕینەوەی خۆری و مووی ئاژەڵ.

**هەڵدێر:** ١. جێی هەڵەمووت ٢. تاڤگە.

**هەڵس و کەوت:** ڕەفتار.

**هەڵکوڕمان:** کزەڵۆک بوون.

**هەڵگر:** لە خۆ گر.

**هەڵۆ:** ئەیلۆ، باڵدارێکی ڕاوکەرە.

**هەندەر:** توخن، قەرە، نزیک.

**هەنگ:** مێش ، مێشەنگوین.

**هەوانتە:** بێ بایەخ، قوڕ.

**هێشوو:** وشی، هووشی ترێ.

**هێڵ:** خەت.

**هێڵی کۆتایی:** خەتی بڕانەوەی پێشبڕکێ.

**هیوا بڕاو**: هێڤی شکست، ناهومێد.

**یارمەتی:** ناریکاری، یاریدە

**یاڵ:** مووی سەر ملی شێر و یەکسم.

**یەکانە:** بەرازی نێر، بەراز.

**یەک و دوو:** گورج، زووخێرا.



**دەبێت هەر نەتەوەیەک بە زمانی خۆی**

# ئیزۆپ

**بخوێنێتەوە**



لە بڵاوکراوەکانی:
کتێب و پەڕاوگەی کیا
بانە: ژێر مزگەوتی گەورە
تەلەفوون: ٠٨٧٥٤٢٢٧١١٢-